# باڵندەکانی کەندێناوە



ماجد مەحەمەد مەخمووری

٢٠١٨

ناوی کتێب: باڵندەکانی کەندێناوە

بابەت: ڕۆمان

نووسینی: ماجد مەحەمەد مەخمووری

تایپ:

چاپی یەکەم ٢٠١٨

چاپخانەی شەهاب – هەولێر

ژمارەی سپاردن ١٦٠ /٢٠١٨ – هەولێر / هەرێمی کوردستان - عێراق

ناونیشانی فەیسبووک: https://www.facebook.com/majd.mahamad

## ئەم ڕۆمانە

دڵۆپی بارانە، پەنجەرە دارەکەی ئەوسای خانووە قوڕەکەمانە، ئێوارە ڕەش و سپییەکانی کۆڵانە، دێرە شاراوەکانی خوێنمە، پەنجەی شکاوی دەروونمە، پەلاماری پایزی تەمەنە، کۆچی ناوادەی قەسەمە، دەنگی قرچەی دڵی داروبەردی وڵاتمە، بیری ئازادی لاوێکی نیشتمانمە، هاژەی ئاوێکی بێوەفایە کە هەرگیز ناگەڕێتەوە.

ئێواران زەردایی خۆر، لەنێوان قۆپکەکانی ئاشی باو پەلەهەورێکی چڵکندا کاریتە درێژو زیادەکانی سەربان و دەلاقە سێگۆشەکانی خانووی گوندەکەی زەرد دەکردن، کەڵەباب و مریشکەکانیش بەدوقەدوق لەسەربان و کاریتەکان ریزدەبوون، ئەوانەی جوچکەداریش بوون، بەخانومانی دەچوونەوە کۆریتەکانیان و جوچکەکانیان دەخستنە بن باڵیان، پیرە درەختە هەڵچوەکەش ئامێزی بۆ سەدان فرندەو باڵندە واڵا دەکرد، کەبەسەماو ئاپۆراو جریوەی خۆش ئاهەنگ دەنیشتنەوە سەر لق و چڵەکانیەوە، کوکوختیەکانیش لەلقە بەرزبەرزەکانی دەنیشتنەوە، بزنی مس و گۆردی کارو گۆردی پۆش و بزنی بەل وکۆریسیش بەپێش شوانە دەکەوتن و بەخۆش ئاوازی زەنگوڵ و قرقرەوە، بەرەوماڵ وحەوشەو حەساران دەبوونەوە، کەهەر دە دوازدەکیان هی ماڵێک بوون و شوانە بەکوتە بۆیانی دەبردن، دەنگێکی نەرم لەمزگەوتە قورینەکە دەهات و بانگی ئێوارەی دەدا، سافیە منداڵەکانی لەژووری بەجێ دەهێشت و پێی دەگوتن: نێنە دەرێ، دنیا هەن ساردە دەقەسرن، قورولیتەیە پێتان خواسەوعەدم دەبن، هەوکە دێمەوە، بەس ئەوهەشت نۆ بزنەی لەهۆرێ دادەکەم و جامۆکە شیرەکی بەتامیشتان لۆ دەینم.

شكۆ حەزی دەكرد بەدوای دایكیدا بچێت، (خەرمان) ی خوشكیشی دەیخافڵاندو كڕی دەكردەوە، دەیگوت: تاریكەشەوەو سەرمایە، دەرێ هەموو قوڕە، هەوكە داكم دێتەوە.

دەرگا تەنەكەكەی حەوشە جیڕەی هات و سابیری باوكیشیان لەنوێژێ هاتەوە، ئیدی كەمێك فەرامۆش بوونەوە، خەرمان لامپا شووشە دوكەڵاویەكەی بەپارچە پەڕۆكێك خاوێن كردەوەو دایگیرساند، دوای نان خواردن، سابیر رووی لەسافیەی خێزانی كردو پێی گوت: دەزانی ژنێ شكۆ بویتە حەفت ساران و دەبوایە پار لەمەكتەبێ قەیدمان بكردبایە ؟، بەرام چونكە تەسكەرەی نەبوو لۆیە نەمانتانی، بەس بەتەمامە لەو دوسێ رۆژەی بیبەم تەسكەرەی لۆ دەرینم ولەمەكتەبێ قەیدیكەم، با كۆرەواریش نەبی، شكۆ كەئەمەی بیست زەردەوبزە لەسەرلێوەكانی ئاوێزان بوون و ریزی وردە ددانەكانی دەركەوتن، ئیتر دەبێ بەهاودەمی كتێب و دەفتەرو قەلەم و هاوڕێی داراو بەبەی زەینەب و لەبڕی راكەڕاكەی بەدوای كاروكاریلەوە، راكەڕاكەی ئەمجارەی بەدوای مام زۆراب و ئەی تۆپەكەو پشەسپی و داوی دارا دەبێ، ئیتر رۆژی دەرهێنانی ناسنامە هات و بەلای شكۆوە رۆژێكی جیابوو!، رۆژێك هەرلەجەژن دەچوو!، كەبینی دایكی گوشێكی هەڵبڕی و بەدەزووی سەوزوسوورو زەردەوە، نەخش و گوڵ و گورینگی لۆكردن و كردی بە توورەگەی كتێب بۆی، باوكیشی بەرگێكی جیا لەڕۆژانی تری پۆشی بوو، دەمەو بەیان بەرەو (دیبەگە) كەوتنەڕێ، ئیتر شكۆ بوو بەخاوەنی ناسنامەو كتێب و تێنووس و پێنووس، بەڵام ئەو جەژن و شادیە تەنها بۆ شكۆ بوو، نەوەك بۆ خوشكەكانی! ئەوان دەبێ ببن بەكابان و بیری وهاوڕێی هەوێزو پەرێزو هاودەمی هۆنینەوەی كەزی و بسكی تاریكی، ئەوان دەبێ بارگەوبنەو پرێسكەی رۆحیان لەوبنارە بكەوێ و لێرە زێتر درك بەدونیا نەكەن، ئەوان زوڵمەت هەزار فەرسەخ لەپێشیانەوهەزارشار بەرەودوا لە مانگ گەڕاونەتەوە، لەهەزار باغ، هەزار

حیکمـەت دوورتـرن، ئـەوان دەبێ خەونـەکانیان لـەبنمیچی ژووریکی تاریک بشـارنەوە، چونکە ئـەو مەملەکەتـە هـی پیاوە پیـاو، لێرە پیـاو لـەدوای خـودا حـوکمی زەوی دەکـا، ئەوکاتانـەی کـە سـافیەیی دایکـی خـەریکی باخچـە بچووکەکـەی بـەرماڵێ بـوو، کەهـەر بەشـی خۆیـان و کـەمێکیش بـۆ ئـاوایی دەکرد، شکۆ بەدیاریەوە لەسەربەردێک دادەنیشت وسافیەش پەلکەدارو گەڵا وەریوەکانی نێو جۆگەلەی ئاوەکەی لادەدا، کە لەکانی بێرۆکـەوە هەڵدەقوڵاو هـەر دووکـانێکی باخچەکـە کەپێویسـتی بـەئاو بوایـە رێگـەی بـۆ دەکـردەوە، تـەڕەپیازو تەڕەتوولـەو کـەرەوزو ناسـکە تـوورو کـەمێک سرقیشـی تێدابوو، کەهـەر وەرزێـک و بەچانـدنی شـتێکەوە خـەریک دەبـوو، سـافیە ژنـێ بـوو هـەردەم حـەزی دەکـردو زۆر خۆشـحاڵ دەبـوو بـەخواردنێک کەبەرهـەمی دەسـتی خـۆی بوایـە، لـەم کـات و سـاتەدا، سـابیر لەخـەمی نـان و سـافیە لەخـەمی پـەروەردەو گـەورەکردنی منداڵەکانیـدا بـوو، شـکۆش چـاوەنۆڕی کردنـەوەی دەرگـاو مینبـەری قوتابخانـەو گـوێ قـوڵاخ بـۆ زەنگـی خـۆش ئاهەنگی گەرمە بانگی پۆل پۆلی هاورێکانی بۆ پۆل، نەخۆشیەکی بێ ئامان و بێ دەرمان و رووەو نەمان، بەرۆکی سافیەی گرت و هێدی هێدی پەل و پۆی پـێ شـل دەکـردن، سـەوزایی باخچەکـەش وردە وردە بـەرەو زەردایـی هەنگاوی دەنا، جۆگەکەی بـەرماڵیش، گەڵا وەریـوە خەزاناویـەکان بـەری پـێ دەگرتن، پەپوولـەکان کـەمتر حـەزیان بەنیشـتنەوەو سـەماو وشـایی ئێوارانی سەرئاسمانی باخچەکە دەکرد، فڕندە دەنگ خۆشەکان ئیتر لەسـەر تـەناف و رستەی جلوبەرگ و دەم جۆگەلەکان نەدەنیشتنەوە، نەخۆشـی سـافیە پـایزو خەزانی هەمووان بوو، بزەو خەندە جوانەکانی شکۆ ببوونـە بەنـدەرێکی لێڵ، نیگاکـانی لەسـاتەوەختی بوومەلەرزەیـەکی پڕگریـان دەچـوو، کەهـەموو خەونـەکانی رابمـاڵی، باسـکی سـافیەی دایکـی نـەرمترین سـەرین بـوو بـۆ سـەرخەوشکاندنێکی شکۆ، کەلەگەرمترین باوەشـی لێوان لێو لەمیهرو سۆزو بـەزەیی، سەرخەوشـکاندنێک لەباوەشـێک کـپ و بێـدەنگ، ئـاوێزان

لەخۆشەویستی و جوانی، شیرینتر لەژیان و گیانی، شکۆ وردە وردە تای دابڕان لەدایکی دەیبوزڕکاند رەنگی و زراوی چووبوو لەزەنگی مەرگی دایکی و نەفخی سووری هەموو دونیایی، بەپەنجە ناسکۆڵەکانی سەروچەفیەکەی دایکی رێک دەخستەوەو نەیدەزانی هیچ بڵێ!، نەیدەزانی بڵێ دایە گیان پێویستی بۆم و باوەشی بەهەشتیت تاکە مەنزڵگاو ئارامگایە بۆم، نەیدەزانی بڵێ دایە، تەنیا لەتۆوە خۆشەویستی دەبینم و ئاشنایی بوومە، شکۆ چاوی بڕیبووە چاوە کزو پڕ حەسرەت و پڕمەینەتیەکانی دایکی، ئەو چاوانەی کەلەهەر تروکانێکدا تابلۆیەکی رابردوو، تابلۆیەکی داهاتووی ژیانی شکۆی پیشاندەدا، شکۆ دەترسا لەداخستنی دواجاری چاوەکانی دایکی و بینینەوەی هەموو تابلۆکانی جاران، بنەوبارگەو کۆچ و کۆچباری هەڵگری بۆ دواهەواری تاڵترین یادگاری، دەترسا لەو رۆژەی کەبگەڕێتەوە ماڵێ، بۆن و بەرامەو سۆزو بەزەیی باوەشی گەرم و باسکی نەرم و بزەی گوڵ و قوربان قوربانی ناخی دڵ و قیلم قاسێ و کۆبوون و کۆک بوونی سەرخوان و شەوچەرەی شەوان و هەقایەتی بەرئاگردان نەمابێ و داڕمابێ، ئیتر باوەشی هەموو دونیا نەتوانێ جێگەی بۆ بگرێتەوە، شکۆ زیاتر لەجاران هەوڵی یارمەتیدانی دایکی دەداو ببوو بەهەڵگری خەمی خاوێن کردنەوەی جۆگەلەکان، کەپێشتر خەمی دایکی بوو، دۆخ و دەردو نەخۆشیەکەی سافیە، سات لەدوای سات زیاتر تەنگی پێ هەڵدەچنی و لەمەرگ نزیکتری دەکردەوە، تا وای لێهات بەجارێ پەکی کەوت، هەواڵی رەش و درکی رەشەبا، کوڵانەکانی ئاوایی مات کردبوون و پیرێژنەکانی راپێچ کردن و لەچواردەوری کۆبوونەوە، سات سات دێمکەیەکی ئاوی گەرمیان دەخستەبەر پشت و هەناوی، نووشتەیان دەخستە بن بالیفەکەی و قورعانێکی داپۆشراوی ماڵی مام سەید لەژوورسەری، هەموو بەدەم دوعاکانیانەوە مەلوول دادەنیشتن،

شکۆ دەیویست جورئەت بداتە خۆیی و خۆی بکاتەوە ژوورەکەو بنووشتێتەوە باوەشی دایکی و هەموو دەمارەکانی پرببنەوە لەئارامی و ئۆقرەیی، گووڕی لافاوی فرمێسکەکانی هەڵڕێژێ و دەریای قووڵی ئەشک و زامەکانی سەراوژێرکاو پێی بڵێ: دایە دەهەستەوەو چاک ببەوە، ئەوا جۆگەلەی باخچەکەشتم خاوێن کردۆتەوە، دەرگا شڕەکەی حەساریشم کردۆتەوەو ئێستا بزنەکان دێنەوەو بیاندۆشە، کەچی لەبەر پیرێژنە رەشپۆشەکان نەدەکراو ئاسان نەبوو، بۆیە لەپەنجەرە بچووکەکەی کە بەجەلاتینن گیرابوو، بەپەنجە حەسرەت بارەکەی کونێکی لێ کردبوو و لەوێوە لەمەداری هەموو دوونیای دەڕوانی، چاوەکانی بڕیبوە ئەو درزە بچووکەی کەهەموو نووری خودای تێدابوو، لەوێوە سەیری هەناسە تەنگەکانی دایکی دەکرد، کەلەشنەی هەموو کوێستانەکان بۆن خۆشتربوو، لەوێوە سەیری تروکانە کزەکانی چاوی دەکرد، کەتریفەی لەهەموو ئەستێرەکانی دوونیا جوانتربوو.

شکۆ هەرچاوەنۆر بوو دایکی وەک جاران چاوەکانی بکاتەوەو هەڵسێتەوە و بڵێ شکۆ وەرە کوڕیژگەکەم من چاک بوومەتەوەو باسەرێک لەباخچەکە بدەینەوە، باگەلاو پەڕو پووشان لەجۆگەلەکەوە دەربێنین، شکۆش گورج بەپێشی بکەوێ و پربەگەرووی بڵێ دایە سبیانێ هەمووم خاوێن کردنەوە، وەرە تەمەشاکە، بەڵام چاوەنۆڕیی شکۆ لێوان لێوی خەیاڵ بوو، ئاواتێکی دوورە دەست بوو، شکۆ لەهەناسە کزەکانی دایکی و لەو ژوورەی دەڕوانی کەیەکەم ووشەی لێ فێرببوو، کەدایکی تاتی تاتی بۆسەرچاوی چەپ و راستی بۆ دەگوتەوە، کەفێری یەکەم هەنگاوی کردو ئێستاش خۆی بێ هەنگاو ماوەتەوە، شکۆ لەناخەوە دەیویست ببێتە هێزێک و بچێتە ناخی دایکیەوە، سیمای نەخۆشیەکەی لاباو هەم زەمەن و هەم رووی گەشی جارانی بۆ بگێڕێتەوە، وەها ئاوێتەی نەخۆشیەکەی دایکی ببوو، دەست و پەنجەکانی خۆی توند دەگوشین و دەیویست ئەوهێزەی

لەناخیدایــە ببێتــە هێزێــک بــۆ دایکــی، کــەچی رۆژگــار نەبــەزەیی هەیــەو نەفرمێسکی ســەر رووومەتی قڵیشاو دەبینێ، رۆژگار دەڕواو ئاوڕ لــەکاروانی بەرخۆری دەم کەل ئاوابووی کەس ناداتەوە، رۆژگــار دەڕواو بــاڵی شــکاو و کۆشــکی جێمــاو و خورپــەی دڵــی بــێ دایــک مــاو بــە تریفــەی مانگەشــەو دەسپێرێ، رۆژگار دەڕواو بەنیگایەکی ســەرپێ ی بــەزەییش، ئاوڕ لەبــەرخی بەجێماو وئێسکی شکاو و قــەوارەی دڵــی خــوێن تێزاویش ناداتــەوە، رۆژگار دەڕواو ئــاوڕ لەپــەنجــەرەی غــەریبی و چاوەڕوانی کــەس ناداتــەوە، رۆژگــار دەڕواو برای ئەبەدی خۆی بەجێ دێڵی، رۆژگار دەڕواو دوایین زەردەخــەنی زێڕینی لەئێوارەیەکی کش ومات دا بــەجی دێڵێ، دوایین بــاران لەگــەڵ خــۆی دەباتەوەو لێوی هــەربزوڕکاوی زەوی تەڕناکاتــەوە، رۆژگــار دەڕواو وەڵامــی دەســتی لــەرزۆکی هانــای کەســیش ناداتــەوە، رۆژگــار دەڕواو لــەجامی غــەم ژەهــری بیــرەوەری دوێنێمــان دەکاتــە دەم، پرێســکەی ناســۆری ئەبــەدیمان لەژوور سەرو بنمیچی ژوورەکان بۆ بەجێ دێڵێ، رۆژگــار ئەوەنــدە دڵڕەقە، رەنگە خودا بەردی لێ درووست کردبێ، ئێوارەیــەک بەرلــەرۆژئاوا، رۆژگار رۆژی شکۆ و خوشکەکانیشی ئاواکرد، ئێوارەیەک ئاو سەفەری یــەکجارەکی کــردو بــوو بەســـەراب، گوڵـــەکانی ئەوماڵـــە ســـیس بوونـــەوەو گـــەڵاکانی زەردهەڵگەڕان، بزەوخەنــدە ناسکەکانی شــکۆ بــوون بەپەپوولــەو هــەڵوەرین، نەباوشە قەتێ ماو نــەجارێکی دی ووشــەی دایــە دەنگی دێتــەوە لەوهەیوانــە، سافیە مردو بەدیار دیدەنی شکۆوە، بەیەکجاری لەژوورەکەیان هێنایە دەرو بـــەرەو گۆڕســـتان و گۆڕخانـــەیان بـــرد، لـــەنێوانی کۆمـــەڵێک تاشـــەبەردی ساردوسڕ، بناغــەی ماڵێکیــان بۆ هەڵکەند، ئــەوان خێراخێراو شــکۆی حــەوت ساڵانیش بەتیلەی چاوەکانیەوە هەرچاوەڕوانی خەبەرهاتنــەوەی دایکی بوو، هێشتا بڕوای وابوو دایکی خەوتووەو ئێستا خەبــەری دەبێتــەوە، چەنــد رقی لەوانــەبوو کــەماڵێک بــۆدایکی درووســت دەکــەن، ئــەو دەســتەکانی خــۆی دەگوشــین و لەدڵــەوە هــەردەیگوت: دایــە دەهەســتەوە زووبــە، ئەوانــە هەوکــە

لەبن عەردیت دەنێن، خۆرت لەسەر رووودەکەن، شەوێش بەوتاریکەی لێرە بەجیت دێلن، هێدی هێدی ژوورەکەی سافیەش تەواو بوو و چراکەی هەردووچاوی شکۆش کوژانەوە، رۆح بەرەو ئاسمان هەڵکشاو وجەستەش بۆ ناخی زەوی شۆڕکرایەوە، شکۆ نەئاسمان رایدەکێشاو نەزەوی لەخۆی دەگرت، لەنێوانی هەرووکیان ناخی پڕببوو لەباغی جێماو لەگوڵی وێران، لەکاروانی وون زامی خوێن تێزاو، لەکۆشکی بێ شا لەسەری بێ سەر، لەداری بی ئاو درەختی بێ بەر، لەماچی بێ لێو ماندوو و بێ سێبەر، پڕبوو لەدەریا، خامۆش لەماسی، پڕ بەبەرگی خۆی پڕ لەکەساسی، پڕ بوو لەدەست وپەنجەی پڕهانا، پڕ لەسەنگەری دەمی شکانا، شکۆ ئەوشەوە لەباوەشی خوشکەکەیدا رۆحی رووناکی خۆی گوژاندەوەو تاریکی شەو شەوباشی لێکرد، لەنێوهەورە تاریکەکاندا چاوی لەوکفنەیە دەگێڕا کەعیشقی تیا هەڵگرتبوو، چاوی لەوتابووتە دەگێڕا کەتەرمی خۆی تیا نێژرابوو، بەدوای بۆنی ئەوشنەبایە سەرگەردان بوو کەلەباڵاو باوەشی دایکیەوە رادەهات، رۆحی لەنیشتمانێک دەگەڕاو دەیپرسی، کێ باغێکی هەیەو گوڵەکانیم پێ بسپێرێ؟ کێ شەقامێک شک دەبا هەنگاوەکانیم پێ بدا؟ کێ بەلەمێکی هەیە لێوی بەکەنارەوە بێت و چارۆگ و سەوڵەکانیم پێ بدا ؟ من دەمەوێ سەفەربکەم، کێ باڵەکانی فریشتەیەک شک دەبا؟ کێ هەسپە بوراقە باڵدارەکە پێدەزانێ وجڵەوەکەییم دەداتێ ؟ شکۆ ئەوشەوە تاچاوەکانی شەکەت بوون، کۆتری رۆحی دەفڕی وعەشقی خۆی لەگەڵ خۆی دەبرد، تا باڵەکانی رۆحی هەڵفڕین تا منارەکانی ئەودیوی عەدەم، لەعەرشی خوداو هەشت دەرگاکەی بەهەشت دەگەڕا، لەئەدرەسی رەیان و فەرەحی دەپرسی، دەیویست لەباغ وشەقامەکانی فەردۆس پڕبەگەرووی هاواربکاو سافیەی دایکی لەوخەوە قوڵە راچلەکێنێ، ئەویش سەرپۆشە شێواوەکەی ریک خاتەوەو پێکەوە سەرێک لەباخچەکەی بەرماڵێ بدەنەوە، گەڵاوەریوەکانی نێوجۆگەڵەکە رابماڵن. بەیانی، یەکەمین رۆژی بێ دایکیی شکۆ بوو، کە

بەسەر پردی سیراتی یادا تێدەپەڕی، کپ و بێدەنگ بێ هەناسە، بەدیارگۆمی قوڵی بیرەوەری لێخن، هەموو شتێک جێ پەنجەی یادی پێوەماوە، هەموو شتێک وەک خۆیەتی ونەگۆڕاوە، رۆحی شکۆ ببووە پێشانگاو هەموو وێنە ئەنگۆرەکان بەقولابەوە هەڵواسرابوون، لەپرئازارێکی تر، بووە سەرقافڵەو جلەوی یادەکانی راکێشا، گۆردی کارو گۆردی پۆش، هەردوو کاریلەجوانەکانی کە ئێواران شکۆ گەمەویاری لەگەڵ دەکردن، ئەوانیش لەدایکیان جیا کرانەوەو لەسەرسەکۆی حەوشە، ملیان کەوتەبەرچەقۆی رۆژگار، ئەخر میوان دێن و میوان دەڕۆن، فاتیحایەو ورگ زلەکان گۆشت دەخۆن، شکۆ بەدیار یادەوەریەکانی دایکی و غارغارانێ ی حەسارو حەوشەی بزنان، ئەوانیش بەدیارسینی ناسکە گۆشت و رناندنەوەی ئێسکی کاریلەکانی شکۆ. زام دێت و زام دەڕۆن، زام لەدوای زام دەروون دەخۆن، رۆژان هاتن و ئاوابوون، هەمووان بەکۆڵێ خەمەوە لەهەیوان و بنمچی ژوورە سەربەکاریتە پڕیادەکە، بەدیاردەلاقەی زامەکان، بێدەنگی دەیخواردنەوە، بێدەنگی دەیشاردنەوە، بێدەنگ تر لەو کوپپە سامالەی سبەینان سافیە ئاوی تێدەکردنەوە، بەرلەوەی شەودابێت تەنها، بەرلەوەی خۆرهەڵبێت تەنها، شەوان تەوری غەم لقی سەوزی سنەوبەری خەونەکانی دەبڕینەوە، گەردەلوولی مەینەت خۆڵەمێشی نەمامی لێ بەبادەکردن، هاوین خەرمان و گەنمی خەمی شەنەبا دەکردن، پەریزی پیرۆزترین عەشقی لێ دەسووتاندن، بەرلەوەی شەودابێت تەنهایی هەموانی لێک دەکردن، تەنهایی کۆتری رۆحی هەمووانی هەڵدەفڕاند، شەو لەگەڵ خۆیاندا دەرۆیشتن و لەگەل خۆیان بەتەنهایی دەگەرانەوە،

سابیری باوکیشیان بەتەنها لەژوورەکەی تر، هاوڕێ و هاودەمی مژوقومی ئەو دوکەڵەبوو، کەلەکیسەی تووتن و دەفتەری جغارەکەیەوە دەیپیچانەوە، کەلێنی پەنجەکانی زەرد کردبوون، زەرد تر لەئێوارەی خۆی لەرەنگی خۆی زەردتر لەگەلای دارو باخچە سیس بووەکە، زەرد تر

لەخۆری دەم کەلی ئاوابوو، شکۆش ئەوباوەشەی کوێستان وگەرمیانی بوو، یەکەم ئەلف وبێی لی فێرببوو، وەکوسەراب ئیتر ون بوو.

لەمەودوا کەرۆژانەی لەخوشکەکەی وەردەگرت، سەرێکی لەدووکان و کۆلانەکە دەدا، سەرێکی بی سەر، بارانێکی بی هەور، ئاوازێکی بێ نۆتە، شمشاڵێکی بێ کون، ئاهێکی بێ سنگ، خەندەیەکی گریاو، دەمولێوێک گیرۆدەولال، چاوەکان پڕپڕ لەحەسرەت و خالی خالی لەگوناە.

هاوین هێدی هێدی کۆچ و کۆچباری تێک دەنا، باڵندە کۆچەریەکانیش بنەوبارگەیان دەپێچایەوەو بەئاوازی نیازی دیدار پۆل پۆل ئاسمانی کەندێناوەیان بەجێ دەهێشت، کۆچ کەسەری خۆی لەگەڵ خۆی دەبات، ئێمە کۆچەریین، ئێمە راگوزەرین و بەلای درەخت و خۆرو منارەو بەندەرو دەریاو شارو شەقام و میلی کاتژمێردا تێپەڕدەبین، ئێرە میوان سەرایەو ئێمە راگوزەرین، بەلای ئاسنگەرەکاندا دەڕۆین و تێدەپەڕین، بەلای دارتاش و سەپان و جوتیارو عەتارو تەڕاع و دێوەرەو نان و ژیاندا تێدەپەڕین، وەک چۆن (با) درەخت بەجێ دێڵێ، چۆن پەنجە قەیناغ و سەپان داس و سوار هەسپ بەجێ دێڵێ، ئێمەش سفرەی خوان بەجێ دێڵین، بەیانیە بەرچاییەکان و جامی شیر لەلێومان دەبێتەوە، ئێمە کۆچەریین، راگوزەرین.

دەرگای قوتابخانە بچووکەکەش کرایەوە سەرپشت، یەکە یەکەو دوودوو بەمەستی عیشقەوە بەپیریەوە دەچوون، شکۆ چاوەکانی وەک درەختێک لەبڕی گوڵ برینی گرتبێت، وەک باڵندەیەک بەدیار پەرژینی باخەوە مردبێت، وەک ماسیەک بەقولابەوە رۆح بدا، وەک کتێبێک کرابێتە خۆڵەمێش، وەک خۆڵەمێشێک کەوتبێتە بەردەمی با، چاوەکانی پڕبوون لەپایزی خۆی، خالی خالی رەها لەرووناکی وسەفا، نەرم نەرم بەرەو حەوشەی قوتابخانە هەنگاوی نا، وەک عەتری گوڵێکی مردوو، وەک پاساریەکی غەریب، هێمن وەک کەشتیەکی خنکاو. تێنووس و پێنووس و کتێبەکانی وەرگرت و خستیە باوەشی ماهڕەشی بێ بەشی، هەمووان بۆ

مـوژدەی کتێـب وەرگـرتن خێـرا بـەرەوماڵ چوونـەوە، شـکۆ نـەبێ، کـەس چـاوەڕێ ی مـوژدەی لـێ ناکـا، جگـە لـەو دەلاقەیـە نـەبێ کـە قورعانەکـەی چاکبوونەوەی دایکی لێ هەڵگیرابوو، هێدی هێدی لەپیتەکانی رادەما، پەرۆش بۆ ناسینی پیتەکانی ناوی دایکی، پەرۆش بوو بەبەی زەینەب بخوێنێتەوەو دۆی دادا لەبـەربکا، دەیویسـت قوتابیـەکی گـوێ رایـەڵ بـێ، دەیویسـت لەلاپـەڕەی سـنگی سـپی خـاڵی خـۆی برینـەکان بخوێنیتـەوە، چـرا فوولێکراوەکان داگیرسێنێتەوە،

دەیویسـت ئـەو شـەونمانە ببینـێ کـەدوێنێ لەتاریکیـدا وون بـوون، دەیویسـت خۆڵەمێشـی ئەونیشـتمانە سـووتاوەی کۆکاتـەوە، شـکۆ دووایـین بیرەوەریەکانی توورەگە گووشەکەی بوو، کەدایکی بۆ کتێب هـەڵگرتن بۆی دووری بـوو، سـبیانان دەیخسـتە بـن بـاڵی و لـەژوور پـۆلیش بەپەنجـە ناسکەکانی گەمـەویاری بەونەخشـەو نیگارانـە دەکرد کەلەسـەر توورەگەکە دایکـی بـەدەزووی رەنگاورەنـگ نەخشـاندبووی.، چوارمامۆسـتای کـچ لەهـەولێرەوە شـەموان دەهـاتن، لـەدوو ژووری دوواوەی قوتابخانەکـە دەمانـەوەو پێـنج شـەمموان دەگەڕانـەوە، یاسـاکەی حوکومـەت ومیـری ئـەوهـابوو، ئەوانـەی تـازە مامۆسـتان دەبـوو سـالانێک لەگونـدەکان خزمـەت بکـەن، ئـەوجا بگەڕێنـەوە شـار، خـەڵکی گوندەکـەش زۆرریزیـان دەگـرتن ونیوەڕۆیان قاپێکی سەرخوانی خۆیان بـەکیژۆڵەیەک بۆدەنـاردن و سبیانان بێ ماست ولۆرو پەنیریان نـەدەکردن، پـەیمان وەک سێ مامۆسـتاکەی تـر درەخشاوەو و درەوشاوە نەبوو، کچێک لەسەرەتای بیستەکانی تەمەنی، بالا کەمێ کورت، رەنگ و روو بێ دەرمانی ساکارو سـادەی خۆڕسکە جوانیی، چاوکاڵی نەرم، پڕلەئارامی و لە میهرەبانی.،

مامۆسـتا پـەیمان لەلاپـەڕەی هـەوەڵ و وانـەی هـەوەڵ و دیـدو دیـداری هەوەڵـدا، لەپەنجـەرەی چاوەکـانی شـکۆ، شـاری رەش و ئەسـتێرەو مـانگی رەشی بینی، شـەقامی رەش لـەجامی رەش شـیری رەش دەخۆنـەوە، میوەی

ڕەش دەخـــۆن، شمشـــاڵی ڕەش ئـــاوازی ڕەش دەڵێنـــەوە، بـــەفری ڕەش دایاندەپۆشـــێ، نـــوێنی ڕەش بـــەخۆیان دادەدەن، بـــەهاری ڕەش گـــوڵی ڕەش دەگرێ و ئـاوڕی ڕەش لەیـەکتر دەدەنـەوە و مـاچی ڕەش بۆیـەک دەنێـرن، چـــرای ڕەش هەڵدەکـــەن، بـــەڵێنی ڕەش بەیـــەک دەدەن و ئەڵقـــەی ڕەش دەگۆڕنـەوەو تـارای ڕەش لەسـەردەکەن و سـەعاتی ڕەش لەدەسـت دەکـەن، کـــۆلارەی ڕەش هەڵـــدەدەن و نامـــەی ڕەشـــی بـــۆ دەنێـــرن. لەپەنجـــەرەی چاوەکـانی شـکۆ، بـەبێ دووان بـەبێ زمـان حـاڵی دەبـووی لـەوێران بـوونی نیشـتمان، لەکۆشـکی بـێ شـا لەشـووورای ڕووخـاو، لـەلاوی جـوانی بـەدیلی کـوژراو، لەدەسـتی مانـدووی خێرلـەخۆ نـەدیو، تیـری ڕۆژگـاران لەهــەناو چەقیو، لەخۆری کزی نیوە ئاوابوو، کۆچە باڵندەی لەقەفـەز مـردوو. هـەموو شـتێک لەکوچـەو کۆلانـەکانی چـاودا وون بـبن، بـێ باوەشـی و حەسـرەت بـوونی دایـک، سـروودی کەسـەرو کـۆچ وکارەسـات، سـروودی مـەرگی بـێ ولات دەڵێنەوە، چاوەکان دەبن بـە ئاوێنـەو خەنـدە تیایـدا دەسـووتێن و نـابن بەخۆڵەمێش، باڵندەکان ڕۆح دەدەن و نـامرن، مانـگ دەبێتـە کچێکـی کـەزی و بسـک بـەخوێن، هـەور دەیبـارێنێ و ڕۆح هەربیبانـە گوڵشـەن گـەلای دامێنـی خۆی بەدەستی خۆی دەقرتێنـێ، مامۆسـتا پـەیمان لـەچاوەکانی شـکۆدا ڕەوە باڵندە کۆچەریەکانی دەبینی کەهـەردەڕۆن و نەدەگـەن بەمـەنزل و نەدێنـەوە، کوکوختیـەکانی دەبینـی بـەدیار تـابووتی مـەرگی خۆیانـەوە دەگرین، پـەیمان بەحەسـرەتەوە چاوەکـانی شـکۆی دەپشـکنی وهێشـتا بـەدوای ئـەو پیاڵەیـە دا دەگەڕا کەژەهری کردبووە نوتفیەوە، بەدووای ئەوگۆزەیـە دەگـەڕا کـەڕۆحی تیـا هـەڵگیرابوو، چاوەکـانی پـەیمان چـاوی شـکۆیان ڕادەمووسـی، دەیویسـت ئەو کتێبـە بخوێنێتـەوە کەکـەس دەسـتی نەگەیشـتوەتێ، دەیویسـت لەوباغـەدا بسوڕێتەوە کەمیوەکانی برینیان گرتبووە.

خێـرا لـــەوێ هاتـــە دەرێ و پێڵاوەکـانی خوێنـــدەوە، لـــە پشـــتملی کراســـەکەیی و قۆپچـــەی سەردەســـت و توورەگـــە نەخشـــکراوەکەی کتێـــب

ونینۆکـە خوراوەکـانی رامـا، ئەوسـا بینـی بایـە قووشـی مـەرگ هەناسـەی کورتی یـادی سـەربڕیوە، ئەوسـا بینـی وڵاتێک سـەرۆک کۆمـاری کوژراوە، چاوەکــانی دووتــابووتی بــێ نازکــەوتووی لەغوربــەتا بــەجێ مــاوە، هەمووخەریکی هاتووچوو و یاری وغارەوبڕۆ بوون، هەرتەنیا ئەو سیس و پووکاو، بەهەنگاوە نیوەرۆح ماو، وەک ئەوەی گۆی زەوی هی هەمووان بێ و ئەویش تێیدا کرێچی، مامۆستا پەیمان هێدی هێدی زیاتر درکی بەو گۆمـە خوێنـە دەکـردو دەیویسـت زیـاتر مەلـەی تێـدا بکـا، هێـدی زیـاتر درکـی بەدۆزەخی چاوەکانی دەکردو دەیویست زیاتر پێی بسووتێ، شکۆ ئەوەندە غەریبی باوەشی دایکی دەکرد، هەتا پێویستی پێ بوو سـەیری چاوەکانیشـی بکەی، پێویستی بەیەک ووشەش هەبوو، هەتا ئەگـەر نـاوی خۆشـی بووایـەو بانگ بکرایە، بەڵکو لەوچرکەساتەیە لەوبرینە بێتـەدەرێ، نیوەڕۆ دەرسـەکان تەواو بوون، زەنگی ماڵەوەش لێدرا، هەمووان دەست لـەملان و بـەگفتوگۆ و شـادی دەربـرین بـەرەوماڵ دەبوونـەوە، پڕبـوون لەعـەتری عیشـق، پڕبـوون لەمۆسیقاودرووشـم و سـروود، ئـەوان دەچوونـەوە سـەرخوانی گـەرم و سـەریان دەخستەوە سـەر کۆشـی دایـک، تـەنیا گەڕانـەوەی شـکۆ جیـابوو، پربوو لەمـەرگی کـت وپڕ، لـەکۆچی جـەرگبڕ، خوێنی پڕبـوو لـەکۆتری وون، پڕبـوو لەدەسـترێژی ناهـەق، دڵـی پڕبـوو لەفیشـەکی نیشانەشـکێنی رۆژگـار، وەک جۆگەلەیـەکی نـەفام هێـدی بـەرەوماڵ دەبۆوە، بـەرەو ئـەو رێچکەیـەیی کەدوواجار دایکی پێیدا تێپەڕی و هـەموو شـتێکی لەگـەڵ خـۆی برد، هـەموو شتێکیشـی لـەچاوەکانی شـکۆ بـەجێ هێشـت، وەک کێڵگەیـەکی سـووتاو وەک هێلانەیەکی جێماو.

شــکۆ بــەدەم زامــەوە زمــانی گیــرۆدەو لاڵ، مامۆســتا پــەیمانیش لەپەنجەرەی چاوەکانی دەچووەژووری بەسـەفەرێ، ئەودڵـەی بـۆ دەپشـکنی، برینـەکانی دوێنـی وئـەمرۆی دەبینـی بـەخوێن و زام وهەتوانـەوە، کـاروان چیـەکانی دەبینـی هـەردەڕۆن و هـەردەڕۆن بەبەرلێزمـەی بارانـەوە، درەختـە

کوژراوەکـانی دەبینـی بەبــەر قیـژەی بـاو گـەردەولوولی خەزانــەوە، وەک حەسـرەتێ، بـین بـەئاوی سـازگار بنـێ لەسـەرابی بیابانــەوە، لەپەنجـەرەی چاوەکـانی دەچـووە ژووری بەسـەفەرێ، ئـەو شمشـاڵەی دەبینـی بـەدیار نەغمەی ئازارەکانی خۆی، دڵی کون کونی کون ببوو، ئەومانگەی دەبینی تریفـەی خـۆی لـێ ون ببـوو، ئـەو گۆڕغەریبـەی لەشـەڕی سـوپایەک بـەجێ مـابوو، ئـەو نامەیـەی خوێندەوە کـەبۆ خـودا نووسـرابوو، ئـەونوێژەی بینـی لەسەرسـەکۆی پەرستگایەک نووشـتابۆوە، ئـەو بەیانیـەی بینی لـەسـەحەری عومری سەربڕابوو. پەیمان هێدی هێدی شکۆی دەخستە باوەشی و دەستە کڵپەی هانای حەسرەتی دەگرتن، وەک ئەوەی دەستی کەوتبێتە بەرئێسک و پروسـکی خـۆی و لەباغـە سـووتاوەکانی خـۆی نزیـک ببێتــەوە، دەیویسـت لـەخوێنی خۆییـدا بیشـارێتەوەو چیـدی کەشـتی رۆحـی لـەبناری سـەراب نەگـەڕێ، شـکۆ خۆڵەمێشـی حەرفـە سـووتاوەکانی نـاخی بـۆ نەدەکرانــەوە بەووشــە، نەیـدەتوانی بێتــەگۆ و پرێسـکەی ئەوهــەموو زامانــەی بکاتــەوە، نەیـدەتوانی دەسـتی پـەیمان بگـرێ و بیباتەسـەر باغـە وێرانـەکانی ئـەودیوو کەباڵنــدەکانی رۆح دەدەن، نەیــدەزانی وەســفی شــەقەی بــاڵی کــۆترە هەڵفڕیوەکانی رۆحی بۆبکات، هەتا نەیدەتوانی نـاوی ئەندازیاری توورەگـەی کتێبـەکانی پـی بڵـێ کـەهـەردەم پـەنجـەی لەسەرنەخشـەکانی چنیبـوو، شـکۆ لەباوەشـی پـەیمان ئـارام بـوو، ئـەو باوەشـەی شـوێنی دەسـتپێکردنی هـەموو قەسیدەکان بوو، سـەکۆی خوێندنـەوەی ئـەو نامانـە بـوو کـەپڕبوون لەگلـەیی بۆخودا، گۆڕخانەی پیرۆزی مـەرگی ئـازیزان بـوو، باوەشـێک رەنگـە هـەموو باڵندە کوژراوەکانی پێیدا بێنەوە، باغەکان زیندوو ببنەوەو مـانگیش تریفـەیان بۆ بنێرێتـەوە، رەنگـە هـەموو گوڵـە وەریوەکـان بگەڕێنێتـەوە سـەرلقەکانیان، کوکوختیـەکان چڵـە گیـا وشـکەکان هەڵگرنـەوەو هێلانـە درووسـت بکەنـەوە، شــکۆ لەهەناســەو ترپــەی دڵــی مامۆســتا پــەیمان هێـدی هێـدی پڕدەبـوو لــەئارامی، پــەیمانیش ســووتانی بەســووتان پێـدەکرد و ئــاگری بــەئاگر

دەکوژاندنـەوە، زامـی لـەنێو زامـەکانی خۆیـدا دەچانـدو لـەنێو لـەپی دەسـتی سەیری مرواری شکاوی خۆی دەکرد، بەدوای سـەرابی خۆی دەکەوت و لەبناری ئەوسای خۆیدا بنەو بارگەی دەخست، سات لـەدوای سات، ئـەوان بـەتێڕامان و نیگـای چاوەکـان لەیـەک حـاڵی دەبـوون، بەسـووتان و گـڕ یەکتریان دەناسیەوە، ئەوان لەپەنجەرەی چاوەکانی یەکتردا کتێبی خوێناوی یـەکتریان دەخوێنـدەوە، ئەوکتێبـەی پڕبـوو لەکۆشـکی سـووتاو و کەشـتی خنکـاو، پڕبـوو لـەو بایـەیـی کـەجارێکی دی هـەڵناکات، پڕبـوو لەوهـەورەی کەهەموو رۆژ دێت و نابارێت، لەوگەنمەی شین نابێت و گوڵ ناگرێت، لـەو سەپانە مردووەی جارێکی تر داسەکەی هەڵناگرێتەوە، پڕبوو لەو ژوورانـەی دەرگاکانی کلیل دراون، لـەو حەوشـانەی هیچ شتێک تیایدا نـاجولێ، ئـەوان لەچاوەکانی یەکتریدا کتێبی یەکتریان دەخوێندەوە،

کەسـبەینان شـکۆ دەگەیشـتە قوتابخانـە، وەک خـوێن و تریـاک گـڕو سووتانەکانی ناخی بەو دەکوژاندەوە، دەیویست لێوە فەریکەکانی بـەبینینی خەنـدە بکـا، چـاوە غەریبـەکانی لەهێلانـەی باوەشـی ئـەو کڕبکـەوێ، ئەگـەر لەشەرمی مامۆستاکان نەبوایەو ئەوان دیار نەبان، خۆی لەباوەشـی دەنـا، تـا خوێن بەنێو دەمارەکانیدا پیاسەیەکی درێژی دەکرد، ئارامی و ئومێد تێر لـە وڵاتـی وێرانـەی نـاخی دەگـەڕا، نـم نـم بـارانی دەبارانـد و گژوگیـا پرچـی سەوزیان دەکردەوە، دڵۆپە خوناو دەچوونەوە سەر روومەت ولێواری گوڵ گـەڵاش سـەمای بـۆ دەکـردن، شـنەبایەک بـۆنی مێخـەک و رەشـە رێحـانی رادەگێـڕا، هـەرچی باغـە سـەوز دەبـوون، هـەرچی گوڵـە دەمولێـوی سـوور دەکـــردن، خـــۆری دەم کـــەل لـــەنێوانی پەلەهـــەورێک دەردەکـــەوت و گوڵەبـەڕۆژەی سـووتان و حەسـرەت رووی تـێ دەکـرد، قافڵـەی کـاروانی باڵندە دوورەکـان دەهاتنـەوەو لەسـەر جۆگەلەکە دەنیشـتنەوەو تێرتێر ئـاوی عومری ئەبەدیان دەخواردەوە ئاسک بەکارە کۆرپەی دەگووت لێرە لەوبنارە بحەسێوە تادێمـەوە قومێ شیرت بۆ دێنمـەوە، کەروێشـکە بۆرەش تەپپـەی

پاژنـــەی پێــی دەهــات و خــەریکی گەمــەویاری خۆیــان دەبــوون لەگــەڵ چکۆڵەکانی، قوڵت لەهێلانـە قوڕینەکەی دەهاتـەدەرو ئـەوناوەی بەسـروودی ئاوەدانی رادەگێڕا، کەخۆرهەڵدەهات ژیان دەستی پێدەکرد، باوەشـی پـەیمان هەڵهاتنی خۆربوو خۆر، ژیانـەوەی ژیـان بوو، بـەیانیان مەراسیمی گەشتی ئاڵودەبوونی حەسرەت بوو، بەیانیان سرووده ئومێدی وڵاتێکی وێران بـوو، بەیانیان کردنەوەی پەنجەرەو دەرگای قوتابخانەیـەکی تربوو، پڕکردنـی نـاخ بـوو لـەگوناه، بـەیانیان لافـاوی بـەتینی زلهێـزی چارەنووس پەنجـەی خـۆی دەگەسـت، دەبـوو بـەباوەش پێکردنێـک دامرکێتـەوە، لەهاتنـەوەی هەفتانـەی جـارێکی مامۆستاکان بۆ گوندەکە، دوای تـەواو بوونی دەرسـەکان، پـەیمان بەچاوە نەرمەکانی بـانگی شـکۆی کـرد، دەسـت و پەنجـە ناسکەکانی خسـتنە نێو دەستی و بردیە ژووره بچووکەکەی خۆی، سـۆبەکەی داگیرسـاندبوو و ئاوەکـەی سـەری دەکـولا، شـکۆی خسـتە نێـو تەشـتێک ئـاوی شـیرتێن و بەسـابوونی بـۆن خـۆش جـوان جـوان شووشـتی، شـکۆی شـەرم گرتـوو دەیویست بەدانیشتنەوە بیشوا، هەناسـەی لـەخۆ بڕیبوو، لـەپڕ یادەوەریـەک دەستی گرت و خێرا بردیەوە حەمامە کۆنەکەی خۆیان، کاتێ دایکی سـەری دەشووشـت و بەگۆرانیـەوە دەیگـووت: ئێش و قـەرا دەردوبـەرا غـەم وتـەرا لەگـەر ئـەو ئـاوەی لەسـەری شـکۆی بێتـە دەرێ، دەسـتێ مـن نـەبێ دەسـتێ عەیشۆک و فاتمۆکێ بی، تاقە کوڕێ من لەدەردو نەخۆشیان بپارێزی ببێتـە سوارچاکێ گوندی، مرازێ کیژوکاران، بـەژنی بۆن رەشـەرەیحان کەدێتـەوە هێواران، رازو مرازێ کیژۆران..

پەیمان جلی تازەو شاریانەی بۆهێنابوو لەهەولێر، شکۆ یەکـەم جـاری بوو گۆرەوی لەپێ بکا !، یەکەم جاربوو پێلاوی وا ببینێ ! بەرگـە نوێیەکـەی سـیمای وەهـا گـۆڕی بـوو، لـەمناڵی بنـاری کەنـدێناوە نـەدەچوو!، منـاڵانی کەنـدێناوە دەبـوو نـاوە نـاوە پرچیـان بـەمووس بتاشـرێ، تـا نەبێتـە شـانەی رشک و ئەسپێیان، دەبوو جل و بەرگـە یـەکجار کۆنەکانیشیان فرێنـەدەن !،

تـا ئەگەرهەنیشـکی کراسـێک یـان دەلینگـی شـەرواڵێکی تـر بـدڕابا، بۆیـان دەکردنەوە پینە، مناڵانی کەندێناوە کەپێڵاوە لاستیکەکانیان دەدڕا، بەچەقۆی گـەرمی داغکـراو بۆیـان پینـە دەکردنـەوە، کەندێناوەیـەک کـەڕۆژی لـێ ئاوادەبوو، تەنها تررووسکایی چراکان دەیزانی لـەکوێن، نەئەستێرەو نـەمانگ پێـی نـەدەزانین، کەنـدێناوە ئـەوەنـدە بێـدەنگ بـوو، چلـەی هـاوینیش گـەردەلوولـەکان دەهـاتن و نەیانـدەبینی!، مەگـەر باڵنـدە غەریبـەکان لەسـەرعەرەبانەو لـەودەی کـادا پشـوویەکیان بدابوایـە، مەگـەر پەڕەسـێلکە عاشقەکان جارجار بەمیوانی بهاتبـان و لـەبنمچی کاریتەیەک کەزی وبسـکی خۆشەویستی خۆیان بکردبایەوە و تک تک ئاوی چکاوی کوپپەی ساماڵیان بخواردبایـەوە، کەنـدێناوە دووربـوو لەوقافڵانـەی بەڕێدەکـەوتن بۆشـارەکان، دووربوو لـەو ژنانـەی جلی ئاوریشـمیان لەبـەردەکرد، لەوپیاوانـەی خونـاوی سـەرگوڵەکانیان دەخوێننـەوەو لەسـەر بەلەکۆنـەکان دادەنیشـتن، لەوهەرزەکارانەی بەئاوێنە دڵداریان لەگەڵ کچان دەکرد، کەندێناوە مەگـەر وەرزەکان و باڵندەکان پێیان بزانیبایە.

مینبەرو سەکۆی قوتابخانەی شکۆ شنەبای خۆشترین بەهاربوو، بۆنی باوەشـی دایـک وعەرشـی خـوا بـوو، سـبەینان دەهـات و کـەمێک خێـرا پێـی هەڵـدێنا، زەرنـەقووتـەی چاوەکـانی پـەرۆش نیگاکـانی هەڵـدەهێنا، پـەیمان بـووە مـەداری هـەموو بـوون و شـەماڵی کوێسـتانەکان لـەباوەش وهەناسـەی ئەودەشـنایەوە، هاناوهـاواری دەروونـی بەنیگایـەکی سـەرپێ دەمرکایەوە، هەموو رۆژێ کەدەگەڕاوە بـەرەوماڵ، بـەرەو زام و بیـرەوەری تـاڵترین تـاڵ، بـەرەو ئەوخەونانـەی بوونـە سـەراب کەوتنـە نێوچـاڵ، قەبرسـتانەکەی بـەرزایی، لـەنێوانیان جـۆمێکی دڕاوی ئـاوی، پڕلـە ئاومـارو دڕکاوی، هەموو رۆژێ رۆحی شکۆیان رادەکێشا، پرسیارپرسیار؟ دەنگێک لەناخیا پێی دەگووت

: دایکت لەوبەری جۆمەکەوەیە، کێ دەڵێ ئێستا نەگەڕاوەتەوە ماڵەوە ؟ تا تۆدەگەیتەوەجێ ئەو جۆگەلەکەشی خاوێن نەکردۆتەوە ؟ گەنمییشی بۆ جوجکەکان روونەکردووەو هەربەخێرایی لەناندینە دوکەڵاویەکەوە سێ چوار نانیشی بەسێرەکەوە نەداوە ؟ کێ دەڵێ ئیستا چاوەڕێت ناکا ؟ تا لەقوتابخانە دێیتەوە قاپەشیوەکەی تۆی بەسەرقاپێک دانەپۆشیوە ؟.

شکۆ دەگەڕایەوە ماڵ، سەیرێکی لای قەبرستانەکەی دەکرد، چ کاروانێک بەدی نەدەکرا، هاوارێک دەهاتە گوێی و پێ ی دەگووت: شکۆ ئاگات لەخۆبی، بەسەرگوفەکێ دامەڕۆ، شووشەت لەپێی رادەچی، زندوزاری تێدایە، ئەمن چاوم لێتە وەکی سبیانان دەچیە مەکتەبێ، چاوم لێتە وەکی دێیەوە، بخینە دەمەوێ بەژن و بارات ببینم وەکی دەبیە مامۆستا.

شکۆ دەهاتەوە سەرەخۆو بەبیری دەهاتەوە ئەوە قسەکانی ئەوکاتی دایکی بوو، پێشی نەخۆشی ومەرگ و ژان، ئەوکاتانەی توورەگە گوشەکەی لۆدرووست دەکرد، بەدەم چنینەوەی نەخش ونیگارەکانی، دەیویست پڕی بکات لەڕووناکی، پڕلەخۆر، دەیوست خوێنی رووناک بکاتەوەو ئەلف و بێ ی لا شیرین تربکات، ئەوکات دەنگی راستەقینەی هەموو ئەودایکانەی سەفەری یەکجاریان کردبوو، ئەوانەی خۆری خۆیان جێ هێشتبوو، دەیانگوت: لەمن مەگەڕێ، من نە کانی و نە ئاو و درەخت و باغ و باران و کاو کادین و ناندین و گوندو حەوش و حەسارم نیە، لەمن مەگەڕێ، جارێکی دی بەجامێ شیرەوە دەرناکەومەوە، ئێواران حەوشە نارشێنم و گوێت لە تەپپەی نان پێوەدانی سێری ناندینەکە نابیتەوە، کۆشم نابێتەوە سەرینی سەر، نانووشتێمەوە بۆ ماچێکت.

شکۆ لەگەڕانەوەی هەموو رۆژێکیدا، نیگایەکی پڕتامەزرۆی دەدایە باخچەکەی دایکی، کەسیس و زەردو شێواو ببوون، پاچ و پێمەڕەو خاکەناسەکەی وەکو مردوو غەریب غەریب راکشاو، چەقۆی بڕینی ناسکە توورەکان، هێشتا جێ پەنجە بەقوڕەکانی دایکی پیوە مابوو، لەسەرپەیژەی

غـەم دادەنیشـت و مـژی دەدا لـەژەهری بیرەوەری، چیلکە درەختـی وشـکی پایزی خۆی لـەخوێناوی یـاد وەردەدا، بـەدوای قـوڵترین زامـەکانی دادەگـەڕا، چاوەکانی لەدەرگا دەرگای رۆحی خۆی دەداو دەرۆزەی غەمی بۆ دەکردن، یەک یەک بەنێو ژوورە وێرانـەکانی خۆیدا دەگـەڕا، هـەرچی پیرۆزی هـەبوو وێران ببوون، گوڵ گوڵی سەربڕی بوو، بولبول کوژرا بوون.

ئەوکات هـەرچی ووشـەو قسـەوباس و رازونیازهـەبوو کپ و بێدەنگ دەبـوون، چاوەکـانی دەبوونـە پەنجەرەوهـەیوانی حەسـرەت، دەبوونـە گۆمی بیـرەوەری لێل، دەبوونـە کۆترە غەریبـەی دەلاقەیـەکی بـەجێماو، چاوەکـانی پڕبوون لەوچرکانەی کەخۆی تیایدا دەمـردن، لەوسـەعاتانەی کـەخۆی تیایدا نغــرۆ دەبــوون، لــەو زەمەنانــەی کــەمردن لەبــەردەرگای خەونــەکانی نۆبەداربوون، زمانی گیرۆدەولاڵ دەبوون وەک دیلی دەست داگیرکـەر، وەک لاشەی دوای رۆژی کوشتار.

شکۆ لەنێوانی ماڵ و قوتابخانە، لەنێوانی گلان وهەڵسـانەوە، کپ وەک کەمانجەیــەکی تــەل پچــڕاو، رۆژی لــەرۆژان گــرێ دەداو خەناوکــەی بــۆ دەهۆنیـەوە، پەرۆشـی بـاوەش وخۆشەویسـتی پـەیمان هێـزی فێربـوون و نووسینی بوو نەک خەونی گەیشتن بـەئامانج، سـاڵێکی خوێندن تـەواو بوو، خۆشەویستی پەیمان هەر زووفێری کردبوو پیتەکان بناسێ و لەیەکیان بدا، تـا لەسـەر بـەرگی کتێبـەکان نـاوی سافیەی دایـک و پـەیمانی پڕ پـەیمان بنووسـێ، سـاڵێک تێپـەڕێ شـکۆ مـوژدەی دەرەنجـامی دەرچـوونی سـەری سـاڵی بەپەرۆشـی بـۆ پـەیمان بـرد، مـوژدەی هەڵسـانەوەو بـەپێ وەسـتاو، موژدەی چرۆ دەرکردنی درەختێکی دوێنـێ شـکاو، مـوژدەی بـاران مـوژدەی گــەنم، مــوژدەی گەڕانــەوەی یــاران کەلــەناکاو رادەچــەنن، مــوژدەی چاکبوونەوەی کۆنەزام، موژدەی پڕخەتای بێ خەتام،

پـەیمان لەباوەشـی گـرت و پـێ ی گـووت: شـکۆ گیـان ئـەوە سـاڵێکت بەسەربرد، ئاگاداری خۆت بە، هـاوین تـەواو بوو دێمـەوە دەست بەخوێندن

دەكەینەوە، بەردەوام دەبین، دەبێ چاوەڕێم بكەی، خۆت بپارێزە لەبیری ئاو و سەگی هارو دووپشكومار، ئەگەر چاوەڕوانیم بكەی دێمەوە دەتكەمە كوڕی خۆم. شكۆی زمان گیرۆدەولاڵ، كپ و بێدەنگ و مەینەتبار، گوڵاڵەسوورەی سەربڕاوی دەستی رۆژگار، نەیدەزانی بێتەگۆو بڵێ: چاوەڕوانیت دەكەم و لەگەڵمابە، تا سەكۆی گێڕانەوەی هەموو قەسیدەكانم، تاعەرشی هەموو ئەوانەی پڕن لەموسیقای باران، پڕن لەوگۆماوانەی باڵندەكان لێی دەنیشنەوەو خۆیانی لێ پڕعیشق دەكەن، تا تریفەی مانگ دەچێتە نووتفمەوە، تا پەپوولەی تینووی رۆحم خوناوی لێواری گوڵ دەخۆنەوە، تا فرمێسكم بۆ دواجار ئاوێنەی رووم دەشۆنەوە، تا دەمدەیتە دەست ئەوكاروانانەی پڕن لەتێڕامانی كۆتر، پڕن لەهەڵفڕینی عیشق، پڕن لەباڵی گرێدراو، تا دەمدەیتە دەست ئەو دەستانەی رووناكی دەبەخشنەوە بۆشەو، ئەو دەستانەی پڕن لەئاوی نەمری، ئەو دەستانەی وەكو درەخت گوڵ و چرۆ دەردەكەن، شكۆ نەیدەویست لەو باوەشە ئارامە بێتەدەری و بگەڕێتەوە نیو گۆمی بیرەوەری لێخن، منداڵان هەموو دەرەنجامەكانیان بەدەربڕینی شادی شێتانە بەرەو ماڵ چوونەوە، تا مزگێنی سەركەوتن بەكەس وكاریان راگەیەنن، تەنیا شكۆ دەرگاو مینبەروسەكۆی قوتابخانەی بەرنەدەدا، تا دوا دیداری پەیمان ببینێ، دوایین ئاگر كەهەر پێی بسووتێ و نەبێتە خۆڵەمێش، دووایین رووبار كەهەر تێیدا بخنكێ و كەناری خۆی بەرنەدا، دەیویست دوا دیداری پەیمان ببینێ، وەك چۆن خۆر زەوی بۆتاریكی بەجێ دێڵێ.

كاتی رۆیشتنی مامۆستاكان بوو، یەك یەك لەئوتمبێلەكە سەردەكەوتن، كات رادەبرێ و سەعاتی مەرگ لێدەدا، لەچاوەكانی شكۆدا بای رەش پەنجەرەی ئەوهێوارەی دەكردەوە كە ئەندازیاری توورەگە وەگبە گووشەكەی دەستی، دەستەكانی ساردوسڕ ببوون، بای رەش پەنجەرەی ئەو هێوارەیەی دەكردەوە، كەژنە جوتیارەكە پاچ و

خاکەناسەکەی بەرلەخۆی راکشابوون و مردبوون، ئەوهێوارەیەی تابووت و گۆڕخانە خۆری دایکی لێ ئاواکردن، کات رادەبرێ و سەعاتی مەرگ لێیدەدا، پەیمان لەپەنجەرەی ئوتومبێلەکە بەخەندەیەکی گریاو، دەستی ماڵئاوایی بۆ شکۆ بەرزکردەوە، شکۆی پڕلەباڵندەی کۆچ، لەرێبواری وون لەباغیجێماو، چۆن دەتوانێ دەستەکانی بەرزکاتەوە بۆ سلاو. پەیمان رۆیشت و شکۆی لەمینبەرو سەکۆی قوتابخانەکە بەتەنیا جێهێشت، تا دەهات ئوتومبێلەکە زیاتر وون دەبوو، چاوەکانی شکۆش حوکمیان نەدەما، کۆچێکی تر کۆستێکی تری بەجێهێشت، درەختێکی تری بەجێهێشت لەبڕی گوڵ برین بگرێ، مانگێکی تر لەبڕی تریفە تیربهاوێ، باڵندەیەک هەڵتررووشکابێ لەبەر سەکۆی رۆح.

شکۆ هێدی هێدی بەهەنگاوی هیلاکەوە، بەسەر پایزە خاکەوە، سەرلەبەرخۆ بەرەو ماڵ، بالای دڕکە زەردەو ووشکە گیایی کێوی، پاچ و خاکەناس و چەقۆکەی نێو باخچەکەی دایکی بزرکردبوون، شکۆ بەلایاندا تێپەڕی و وەک دووعاشقی لەمێژە جێماو، بەئاوڕێکی کزی سەرپێیانە بەناچاری لەیەک رامان، جۆگەلەی ئاوەکە لەسەرچاوەکەیەوە گیرابۆوە، لەبەرماڵێش ووشک ببوون و پڕ ببوون لەگەلای زەردو پووش و پەلاش، شکۆ گەڕایەوە ماڵەوەو کەس نەبوو چاوەڕێی هەواڵی دەرچوونی بکا، حەوشێکی چۆڵ نەدەنگی دایک و نەباوەشی، نەکۆڕو کۆبوون و کۆک بوونی سەرخوان، دەرەنجامی یەکەمین دەرچوون و فێربوونی خرایە نێو دەلاقەیەک کەپڕی بوو لەشتی کۆن، لەئاوێنەی شکاو، مووکێش و نینۆک بڕو تاخمەتراش و خڕیلەو دەرزی و داو، تەشی و گلۆرەیەکی ئالۆز وەک خەمەکانی تێک ئالاو، قسەوباس و خواس و ورازونیازی سەرنان خواردن کپ و بێدەنگ، ئێوارانی چای گەرم و ماستی بزنێ بەل تام و بۆی جارانی نەمابوو، کزە لامپاکەی ژوورەکەش وەک بووکی بەجێماوی ژێر چەپۆکی رەش چاوەکانی نەوی نەوی بەدیاریانەوە هەڵتروشکابوون، خەرمانی پازدە

بەهار دەیویست جێگەی سافیەی دایک بگرێتەوە، بەیانیان سەری کەندووی ئاردەکەی دەکردەوەو جامێک هەویری وەک خەمەکانی دەشێلا، لەناندینە دوکەڵاویەکەی دایکیشی، بەدەستێکی کەم ئەزموون و نەشارەزا ئاگری دەکردەوە، ئاگردانی گەرم دەکرد، فەرشی رادەخست و نانی گەرمی وەک خەمەکانی دەخستە سەرسەبەتەوە، هێلکەو ماست و چای دەکردە خوانی بەیانیەکی غەریبانە، بەیانیەکی بێدەنگ، بێدەنگ تاڕادەیەک پاساریەکانی حەوشەش دەترسان، بێدەنگ سام لەحەوشەکە دەنیشت، شکۆ هێدی هێدی ترسی لەبێدەنگی دەشکا، دەرگای کۆریتەکەی دەکردەوەو گەنمی بۆ مریشک و جوچکەکان روودەکرد، لەهەموویان رادەماوهەموویانی دەناسی، لەمەڕو بەرخۆڵەکەی، لەبزن و کاریلەکەی، لەو کوکوختیانە رادەما کەهێلانەکەیان جێدەهێشت بۆ گەنم و ساقەسۆرەکانیان بەسووکەسووک سەریان بەرزدەکردەوە، لەهەموو شتێک رادەما، لەو رۆژانەیەی لەدەستی منداڵان بوو کەدەچوون بۆ شت کڕین، لەکون و کەلەبەری مشک و مار، هێلانەی سۆفە، کۆندڕی سەگ، شارە مێرووستان، ئەو دەیویست ژیان ببینێ، دایک ببینێ چۆن فەرخەکانی چاوەنواڕیان دەکەن. رۆژانێک هاتن و بەسەرچوون، چاوەکانی شکۆ هێشتا ماندوو نەببوون، لەوگەڕانەی کە ئامێزو بەهەشت و بەزەیی بیر دەخستنەوە، لەوشتانە دەگەڕا کە رۆژانێک بەردەست دایکی کەوتبوون، لەگلۆرەی بەن لەدەرزی و قولابە، لەکەوری ئارد، لەجامی شیر، لەپیاڵەی چا، لەهەرشتێک بەردەستی دایکی کەوتبێت، هێشتا شکۆ لەخەمی پەیداکردن و بینینی جێ پەنجەی دایکی بوو، سابیری باوکیشی ژنی هێنایەوەو خەرمانی کچە نۆبەرەی خێرنەدیویشی لەبەرامبەردا کردە بن پشک بەنەریتی دیوەخان، سابیر ژنی هێنایەوە، ژنێک لەدرەختێکی پایزی بێ بۆن و بێ بەر دەچوو، ساردوسڕ وەک چلەی زستان، شکۆ هێدی هێدی ئەو تروسکاییە سۆزەی باوکیشی لەدەست چوو، کەجارجارە ئاوڕێکی لێ دەدایەوە، ژوورێک بۆ باوک و باوەژن،

ژووریکیش بۆهەڵفڕینی باڵندەکانی بیرەوەری و حەسرەت، ئەوان هەر ئاسمانی ئەو ژوورەیان شک دەبینی بۆخوا پەرستی و دوعای کڕ، دوعا بۆ گەورەبوونی تاقە براکەیان وسەرلەنوێ ببنەوە ماڵ، دوعا بۆ ئەو چرا کزەی کە رۆژگار فووی لەچرادانی کردبوو، هەموو دووشەمموان بەڕۆژو دەبوون، هەموو دووشەمووان هەمان دوعا، درەنگی شەوانەش پەنجەی کۆچیان لەخوێناوی یاد وەردەدا، کۆچ و کۆچباریان لەبناری خەمدا دەخست..

کات رادەبوری و هێشتا ئازار نەمردبوو، رۆژگار دەهات و دەڕۆیی هێشتا ئاوڕی لێ نەدابوونەوە، هێدی هێدی هاوینیش بەسەردەچوو، شکۆ چاوەڕوانی زەنگی سەکۆ و مینبەری قوتابخانەبوو، چاوەڕێی هاتنەوەو پەیمانی مامۆستا پەیمان بوو، دوایین ووشەکانی لەگوێی دەزرنگانەوە، چاوی لەتەپوتۆزی هەر ئوتومبێلێک دەبڕی کە لەگوندەکەیان نزیک دەبۆوە، زوو زوو دیقەتی دەدایە قەفی زنجیری دەرگای قوتابخانە، چاوەڕوانی پەیمان کەلێنی دابرانی دایکی لەبیردەبردەوە و بۆساتێک کتێبی خۆڵەمێشی سووتاوی زامەکانی دادەخست و بەدیار پردی سیراتی یادەکانی بێنی دەدا، وەکو ئەیوب لەسەر سەکۆی سەرابی چاوەڕوانی هات و نەهاتی پەیماندا، ئەوەندە هێمن دەبوو، ئەوەندە بێدەنگ و بێ جوولە دەبوو، ئەوەی بەتەنیشتیشی تێپەڕیبا نەیدەبینی، با دەهات و گەڵا وەریوەکانی ژێرپێی درەختەکەی دەبردو ئەوی نەدەبینی، کوکوختیەکان دەهاتن و پەل و پووشیان هەڵدەگرتەوە بۆهێلانە ئەویان نەدەبینی، باڵندەکان دەهاتن و بەفڕینەوە قومێ ئاوی جۆگەلەیان دەڕفاندو ئەویان نەدەبینی، رۆژ دەهات و سێبەر دەکشانەوە ئەویان نەدەبینی، سۆفی دەچوونە مزگەوت ودەگەڕانەوە ئەویان نەدەبینی، ژن وکیژی چاومەستی ئاوایی بەگەپ و گاڵتەو شەققەی پێکەنینەوە دەچوونە سەرکانی و دەهاتنەوە ئەویان نەدەبینی، ئەو لەنێوان بیرەوەری و قەفی زنجیری دەرگای قوتابخانەکە نەکەسی دەبینی و نەکەس

دەیبینی،. دەمەو کێشتانەیەک لەدوورەوە دیاربوو، دەرگای قوتابخانەکە تەواو باوەشی کردبۆوە، شکۆ بەتاسەی دیدارەوە، بەڕۆحی پەرۆش بارەوە، دڵنیابوو خۆری ئەوهات لەشارەوە، گورج گورج پێ ی هەڵێنا تانیوەڕێ، ئەوسا زانی نەکراسی قوتابخانە نەدەستەسڕ نەپێڵاو لەپێ، هەرزوو گەڕایەوە ماڵەوەو لەنێو شڕە سندووقەکە جلەکانی پاری لەبەرکردو پێڵاوەکانی سڕینەوە، هێدی هێدیش منالانی تردەهاتن، شکۆ لەپۆلی دووەم دانیشت و چاوەڕێی دەرکەوتنی پەیمانی دەکرد، تەققەی هەرپێڵاوێک دەهات، هەر دەنگێک هەر چرپەیەک شکۆی رادەچەنی، بەتیلەی چاو سەیری ژووری مامۆستاکانی دەکرد، ئەو دیارنەبوو !، شکۆ دەترسا لەبیری چوو بێت، دەیویست بیبینێ و بەپەنجەرەی چاوەکانی بیناسێتەوە، کەکفنی بەری هێشتا گوڵاوی دۆزەخی پێوەماوە، هێشتا فەریکی گەنم بوو پلپلەی رۆحی سووتاوە، شەوانە چاوی رووبارو دڵی پاساری غەریبی باڵشکاوە، شکۆ دەیویست پەنجەرەی چاوەکانی نیشان بدا، چۆن وەکو مۆم داگیرساوە، دەترسا نەیناسێتەوە ! سەیرێکی پێڵاوەکانی دەکرد! هەها ئەوە دیاری خۆتە لەهەولێرێ بۆت هێناوە، گەرچی هێندێکیش بەتۆزەو قوڕی پاری سەر تووڵەڕێی پێوەماوە!،. ئەو رۆژە خەریک بوو وانەکان تەواوبن، کتێبە تازەکانی وەرگرت بەڵام دڵخۆشی نەکردبوون، بەدڵی پڕچاوەڕوانیەوە گەڕایەوە، شەو تادرەنگ بیرەوەری سەری عومری کورتی دەخواردن، لەدوای خۆ خواردنێکی زۆر، لەدوای ئەوەی دڵنیابوو لەون بوونی بەیانی و گزنگی دەم خۆر، پرێسکەی سەراب بوونی پەیمانیشی پێچایەوە بۆشەوانی غەم، تا رۆژانی هەفتە تەواو بوو شکۆ هەرچاوەنواڕی پەیمان بوو لەوانەیەک بێتە ژوورێ، تا پێنج شەممە مامۆستاکان گەڕانەوە، ئەوسا ئومێد دەرگای چاوەنواڕی شکۆی بەیەکجاری داخست، پەیمانیش بوو بەسەراب، رۆیی لەگەڵ ئەو رەوە کۆترانەی کەهەر دەڕۆن و دەڕۆن، نەدێنەوەو نە وون دەبن، وەک ئەوکتێبانەی کەهەردەسووتێن و نابن بەخۆڵەمێش، وەک

ئەوخوێنانەی هەردەڕژێن و ووشک نابن، وەک ئەوکاروانە تینوانەی بێن بەئاوی سازگار دەنێن وهەرتینوون».

هەمووان لەمردنی میوانسەرای چاوەکانی شکۆ گەیشتبوون، لەمەرگی تێرامان و نیگایی نەوی نەوی بێ ئومێدی، مامۆستاکە خەریکی وانەگوتنەوەبوو بەدەنگێکی بەرز، شکۆ لەڕیزی پێشەوەی کورسی لای دیوارەکە دادەنیشت، بەپێنووسە دارەکەی و پەنجە بێنازەکانیەوە هێدی هێدی خەریکی نووسینەوەی نووسینی سەر تەختە رەشەکەبوو، لەووشەیەک رادەماو پیت پیت لەسەر لاپەڕەکەی لەیەکی گرێدەدان و دەینوسینەوە، لەپڕمامۆستا پەیمان بەچاوگێڕان بەژووریکەوت و گوتی: مامۆستا بەیارمەتیت کوا شکۆ ؟».

شکۆ هەڵسایەوەو پڕبوو لەقوڵپی گریان، پڕلەکانی وکورەی بوڕکان، پڕبوو لەووشەی سەربڕاو، پڕخوێنی بەناهەق رژاو، پڕلەباڵندەی خەراباتی غەم، پڕلەکوژراوی دیل کەوتووی بەدەم، زمانی گیرۆدەو کپ، نەیدەزانی بڵێ سووتانی روو و دۆزەخی چاوەکانم هەرهیچ نیە! نەیدەزانی بڵێ وەرە بەنێو خوێنم بڕۆ ژووریَ و لەوهەیوانە رابمێنە، سەیری دووایین خوان ونان و بەیانی جێماوبکە، سەیری دواجاری ئەودەستانە بکە کەدەرگا رادەکێشن وهەموو شتێک جێدەهێڵن و ناگەڕینەوە، نەیدەزانی بڵێ وەرە شایی لۆغانی غەم وحەسەرتی ئەودڵەم بۆ تەماشاکە، عیبرەتی مردن و زام و گلانی ناخم ببینە، گویَ رادێرە بۆ سەدای سرورودی شەهیدو دۆڕێ می خۆری ئاوابووم، کەمێ هێواش پێ هەڵێنە، کەمێ هێدی رابمێنە، ئێرە نیشتمانی غەریبانەو هەربن بەردێ پڕ لەخەونی بەجێماو و پڕلەخوێنە».

شکۆ کانی فرمێسکی تەقیین و بێ ئەوەی گویَ بەهاوپۆلەکانی بدا، خۆی کرد بەئامێزی پیرۆزی بەسۆزی مامۆستا پەیمان و سەری بەهەناسەی کرد، تاخوێنی دەمارەکانی پڕبوون لەویساڵ، تافرمێسک گەیشتنە گۆمە خوێنەکان، پەیمان دانی بەخۆیدا گرت وفرمێسکەکانی

کەلەبچەو زنجیرکردن و مۆڵەتی لەمامۆستای وانەکە خواست و شکۆی لەگەڵ خۆی بردە ژوورەکەی، لەوێ فرمێسکەکانی سڕینەوەو دەستە قەرەشتیەکانی ماچ کردن و پێ ی گووت: شکۆ ئیدی مەگری، لەمەودوا زیاترخۆت فێری نووسین و خوێندنەوە بکە، دەبی ببیتە مامۆستاترین مامۆستا.

شکۆ بێدەنگی شکاندو بەهەنسکەوە: ئەتوو لەکێ بووی ؟ ئەدی نەتگۆت هاوین خلاس بی دێمەوە ؟ مامۆستایەکان هاتن وبس ئەتوویان لەگەرنەبوو!، گۆتم داخوە داکی نەیهێشتیە بێتن. پەیمان زیاتر خستیە باوەشی و گۆتی: نانا شکۆ لێرە دەبم هەتا ئەتوو گەورە دەبی ئێرە بەجێ ناهێلم، کەس کوڕی خۆی بەجێهێشتیە ؟. شکۆ بەهەنسکەوە: ئا، داکم نەخۆشکەت و مرد، هەموومانی بەجێهیشت.

ئەوجارە پەیمان بەتەواوی تواناو زنجیرو بەستەبەندی فرمێسکەکانی پچڕان و رووباری چاوەکانی تەقین و فرمێسکی نەپساوەی شۆڕبوونەوە، بۆکڕبوونەوەی خۆی و شکۆش، دەستی برد بۆ جانتا گەورەکەی دواوەیی و کردیەوە، جل وبەرگی قوتابخانەو کراس و دەستەسڕو نینۆک بڕو گۆریەو پیلاو و پەنجەوانەو چەتری بارانیشی بۆهێنابوو و پێی گووت: پشتی دەست وپەنجەکانیشت قەرەشتین و ئەوهەفتەیە بگەڕێمەوە لەگەڵ خۆم وازەنینیشت لۆ دێنم. دیارییەکانی پەیمان چاوەکانی شکۆی پڕتریفەی ئومێدو شادوومانی کردبوون، چرۆی خەندەیەکی ساوای دەردەکرد، پڕلەتامەزرۆیی سەیری دیاریەکانی دەکرد، وەک چۆن پەپوولە یەک یەک گوڵەکان دەپشکنێ و لێیان دەڕوانێ، کلیلی غەمەکانی لەبیرچوو بوو تا دەرگایان لەسەربکاتەوەو خۆڵەمێشی باغی عومری بداتە دەم با، بەدوای سەرابی خۆی بکەوێ و چیلکە درەخت لەگۆماوی برینی خۆی وەربدا، گەڕانەوەی ئەو رۆژەی شکۆ پڕ لەهەنگاوی وردیی تامەزرۆیی بوو بەرەو ماڵ.

شادیی شکۆ گەڕایەوەو قوتابخانە بۆوە بەمینبەرو سەکۆی ساڕێژ بوونی زامەکان، بۆوە بەڕووگەی ئەوبنارەی کەبای شەو دێ و گوڵی باغەکان ماچ دەکات، باوەش لەدرەختە غەمگینەکان دەداو لەگەڵ کوکوختیەکان سەیری مانگ دەکەن، ئیدی ئەو دەرگایانەی نەدەکردنەوە کەپڕ بوون لەپۆلی ئاگرو باغی سووتاو، پڕبوون لەباڵندەی مردوو لەهێلانەی جێماو، ئەو دەرگایانەی نەدەکردەوە کە لەگەڵ خۆیدا دەڕۆیشت و لەگەڵ خۆشیدا دەگەڕایەوە..

بەیانیان مەراسیمی عیشقی پەپوولەو گوڵ، باغ و باغەوان، مەراسیمی ئەو جۆگەلەیە بوو کەدرەخت و نەمامەکان لە نوتفی خۆیان هەڵیان دەکێشا، تا پڕدەبوون لە زوڵاڵ، پڕدەبوون لەو خونچانەی تازە بای بەیان ماچی دەکردن..

بەیانیان شکۆ پەلەی دیداری پەیمان بوو، تا گەلاوێژی یەکتر لە سایەقەی لوتکەی چاوی یەکتر ببینن، تا تریفەی ئەستێرە بگۆڕنەوە، تا ئەلیف بێیەکی تر بنووسنەوە، خەونێکی تر ببینن.. شکۆ بەزمانی جەستە دەیویست بە پەیمان بڵێ ئەو جلانەی بۆت هێناوم خۆشم دەوێن و بەخاوێنی دەیان پارێزم، ئەو لۆچانەی لەنێو شرە کەنتۆرەکە گرتبووی بەپەنجە رێکی دەخستنەوە، پێڵاوەکانی دەپاراست لەهەنگاوی نەشیاو، پەیمان لەنێوانی دەرسەکاندا شکۆی دەبردە دووکانەکەو کێک و شیرینیان دەخواردو دەگەڕانەوە، دوای نیوەڕۆیانیش شکۆ لەبەر باخچە جێماوەکەی دایکی سایەدی پەیمانی دەکرد، تا دەهاتە بەردەرگای قوتابخانەو دەچۆوە لای، ئەگەر لەترسی سابیری باوکیشی نەبووایە شەویش شکۆی لای خۆی دەهێشتەوە، دوو ژووری خشت قوڕی سەربەکاریتە هەر لەحەوشەی قوتابخانەکەبوو، یەکێکیان ژووری پەیمان بوو، دوو قەرەوێڵەو مێزێکی بچووکی نان خواردن و تەباخێکی بچووکی خواردن درووست کردنی لێ بوو، زۆرجار شکۆ تائێوارەو ئاوابوونی خۆر لەوێ دەمایەوە، پەیمان

بەهێمنی کتێب و چیرۆکەکانی بەرئاگردانی بۆ دەخوێندەوەو وانەی رەنج و رۆژگاری دووری فێردەکرد، لەدەروازەی میوانسەرای دەچووە ژووریێ و بەسەرهاتەکانی ژیانی بۆ دەکردە هەگبەو زمان و رێنوسی، شکۆش وەها لەگەڵ چیرۆکەکان ئاوێتە دەبوو، هەرئەوەندەی دەزانی ئێوارەیەو واخۆرئاوادەبێ، ئیدی دەگەڕایەوەماڵەوە، ماڵێکی بێدەنگ و ساردوسڕ، بەدیار چرادانی ژووری خوشکەکانی باڵندەی خەمەکانی بەرەو وێرانە دەفرینەوەو دەنووکیان لەزام و بیرەوەری و حەسرەت وەردەدا، کات ئاوڕی دەدایەوە ئەو ئێوارانەی کەسافیە گەرموگوڕ دەهات و دەچوو، سەرێک لەناندین و سەرێک لەباخچەو حەسارو دەستنوێژ گرتن و سایەدبوونی بانگی مزگەوتەکە، ئەو ژوورە ئەوەندە بێدەنگ دەبوو!، هەستیان بەسەرابی هاتووچووی دایکیان دەکرد، گوێیان لەتەپەتەپی ناندینەکە دەبوو !، لەڕاکێشان وجیرەی دەرگا تەنەکەکەی حەساریێ، کە سافیە بەجامە شیرەوە دەهاتەوە، بەجۆرێک بێدەنگ دەبوون، گوێیان لەو دوعایانە دەبوو کەسافیە بەدەم دەستنوێژ گرتنەوە دەیگوتنەوە، بۆنی ئەوعەترەیان دەکردەوە کەمێخەک و قەنەفری خەناوکەکەی سافیە، ئەوسای حەوشەکەی پڕدەکرد.

نیوەڕۆیانی پێنج شەممە زۆربەی مامۆستایانی گوندەکانی کەندێناوە هەربەپیاسە تاسەرشەقامی گشتی بەپێ دەڕۆیشتن ولەوێ ئەو ئوتومبێلە درێژەی تایبەت بەخۆیان دەهات و دەیبردنەوە هەولێر، شکۆ هەموو پێنج شەممەیەک هاوخەمی هەڵگرتنی جانتاو کەلوپەلەکانی پەیمان بوو، تا دەگەیشتنە سەرشەقامەکە پەنجەکان و دەستی پەیمانی بەرنەدەدا، ئوتومبێلەکە دەهات و هەمووان سەردەکەوتن، پەیمان لەپەنجەرەکەوە بەشکۆی دەگووت: شەممە دێمەوە، دەرسەکانت خوێندبێ، بەخەرمانی خوشکیشت بڵێ جوان سەرت بشواو سەرماشت نەبێ.

ئەوسا پەیمان بەپەنجەکانی ماڵئاوایی لێ دەکردو شکۆش لەتێڕامانی چاوەکان زیاتر نەیدەزانی بڵێ هێشتا چاوەڕێی وانەی سوورو بەری رەنج و رۆژگاری دوورت لێ دەکەم، نەیدەزانی بڵێ هێشتا زۆرم ماوە، مناڵێکی ماران گەستەم، زەرنەقوتەی سەحەرێکم، چاوم ماکی دابڕانی پێوەماوە..

شکۆ لەخۆشەویستی مامۆستاکەی قوتابیەکی زیرەک وخاوێن بوو، زیاتر حەزی لەخوێندن دەکرد، کە (زۆرباشە) ی وەردەگرت خێرا دەیبردەوە لای و پێی نیشان دەدا، پەیمان بەردەوام بوو لەهەڵساندنەوەو گەشاندنەوەو درووست کردنەوەی دووبارەی شکۆ، بەردەوام بوو لە پڕکردنەوەی کەلێنی گەورەی بێ دایکیی، رێگەی نەدەدا چرکەیەک غەمەکانی رابردووی لەنێو کاتژمێری عومری بێنە ژووری، نەیدەهێشت ئاوڕ لەو رۆژانە بداتەوە کەهەواڵی رەش لەگەڵ دەنگی رەشەبا دەهات، پەیمان هێندە شارەزای چاوەکانی ببوو، هێندە لەگەڵ دارکاژی رێ چووبووە ژووری، ئەو باڵندانەی دەبینی کەئێواران بۆ خەم دەفرێ، کە مەلی بیرەوەری رێگەی هەزارو یەک مەینەتی پێ دەگرێ..

پەیمان دەیویست زمانی (با) وگەردەلوول و جۆگەلەی راگوزەری لەبیرباتەوە، تا چیدیکە نامە بۆ ئەو دورگانە نەنێرێ کەهەرگیز دەستی کەسیان پێناگات، تا چیدیکە نامە بۆئەو کەنارانە نەنێرێ کەپڕن لەباڵندەی کۆچ لەهێلانەی وێران، دەیویست زمانی ئاو و فەرهەنگی گۆمی لەبیرباتەوە، تاچیدیکە بەجامی رەش ژەهری رەش لەشەوی رەش نەخواتەوە، پەیمان دەیویست پڕی بکات لەئەستێرەو ئاسمان، لەتریفەو سنەوبەری سەوز، پڕی بکات لەباغ وفڕین لەمرواری شین..

کات تێپەڕی و رۆژان هاتن و بەسەرچوون، شکۆ فێرخوازی دوو خوێندگابوو، بەدەستێک رێنووس و تێنووس، دەستێکیشی داگیرسانەوەی چرابوو..

کەپشووی هـاوینیش دەهـات پەنجـەی کۆسـتی بەهەڵدانـەوەی پـەڕاوی زامـەکانی ئاشـنابوو، دواهــەواڵی مـەرگی بـاغ و لـەناوچوونی گـوڵی تیـابوو، لەهەیوانی زەردهەڵگەڕاوی چاوەڕێ سەمفۆنیاومەراسیم وماتـەمینی مـەرگی تیابوو،.

کــەئێواران، تــای بیــرەوەری و ســـووتان، هێــدی هێــدی دەبــوو بەکولانەوەی زامەکان، دەستی قەدەری خۆی دەگرت و بەرەو دووا هەواری کـپ و بێـدەنگی گۆڕسـتان، بـەدیار مەزارگـەی پیرۆزتـرین پیرۆزیەکانیـەوە دادەنیشت، نەیدەزانی بە ووشە باسی گلەییەکانی خۆی بۆبکا، کە دەگەیشتە سـەر گـۆڕی دایکـی ووشــەکانی هـەموو دەبـوون بەخۆڵـەمێش، نەیـدەتوانی هــەواڵی باخچــە زەردو وێرانەکــەی پــێ بڵــێ، پێــی بڵــێ لــەکانی بێرۆکــەوە جۆگەلەکەیان لەسەر گرتینەوەو بزنـەکانت فرۆشـرانە گۆشـت فرۆشـیکی بێ ویـژدان، لەوسـاتەوە حەسـارەکەمان چۆڵـەو جـامی شــیرەکەشمان وەکـو داهاتوومـان بـەتاڵ، نەیـدەتوانی بڵێ لـەدوای تـۆ خـەرمانی خوشـکم بـەدوو تیرکوژرا، لەلایەک مەرگی تۆو لەولاوە شەوێکی تاریک بێ پرس وڕا بڕیار لەداهاتووی درا، ئێستا نەشیلان شیلانەو نـەچناریش دەشنێتەوە، ئێستا دوو خوشکی غەریبن لەبنمچ و ژووری تاریک هێدی هێدی دەتلێنەوە، ئێستا دوو پایزی زیزن دوومەرکانەی بەجێماون، دوو کۆتری نەشارەزای بەشمشێریک سەربڕاون،.

شکۆ لەسـەر گـۆڕی دایکـی چاوەکـانی خـاڵی دەکردنـەوە لەفرمێسـک و هێـدی هێـدی دەگەڕایــەوە، وەرزی هــاوین وەرزی هەڵدانــەوەی لاپــەڕەی مەینەتی بوو،

وەرزی ئـەو باڵندانـەبوو کـەئێواران بــەدووای گــەنمی خەمەکانیانــدا دەگـەڕان، وەرزی هـاوین وەرزی ئـەو گەردەلوولانـە بـوو کـە لـەپڕ خۆیـان دەکرد بەگوندەکـەو بـەکۆنـە زەرف وجـەلاتین وگـەڵاو خـۆڵ و دڕک ودالـەوە دەهاتن و خەندەو بزەو تریفەی چاوەکانی شکۆیان لەگەڵ خۆیان دەبردەوە،

نامەیەکیان بەجێدەهێشت پڕبوو لەنووشتانەوەی چاو و نووشتانەوەی رۆح و شکانی قەدو باڵای ئەو سنەوبەرانەی کەشەوان تا درەنگ چاوەنواڕی مانگیان دەکرد،

شکۆ وەکو دەروێشێک جەستەی لێرەو هەموو باڵندەکانی رۆحی بەسەر دوورگەی غەیبییەوە دەفڕینەوە، جارجارەش لەکەلێنی دەرگای حەوشەی قوتابخانەکەوە یان لەکون و درزێکی بچووکیەوە، سەیری ژوورەکەی مامۆستا پەیمانی دەکردو ئەو رۆژانەی دەهاتەوە بیر کەپەیمان لەنێو تەشتێکدا جوان دەیشوشت و جلی تازەی لەبەردەکرد، نینۆکەکانی دەکردن و لەکەم و کوڕیەکانی دەگەڕاو لەباڵای وورد دەبۆوە، شکۆ هاوارێک لەناخی بوو بەلام نەیدەزانی خۆڵەمێشی ووشەو حەرفە سووتاوەکانی بخاتە نامەیەکو بۆ پەیمانی بنێرێ و بڵێ دادە تۆ لەکوێی ؟ بۆ وەڵامم نادەیتەوە ؟ من لەکوێوە بۆت بگەڕێم ؟ ئێستا گەر هەورت لێ دیارە ؟ باوەشێکی میهرەبانیت بەپەڵە هەورێ بنێرە، تەنیا بانگم بکەو بیدە دەست (با) ، گوێم قوڵاخە بۆ ووشەیەک گەر ژەهریش بێ، ئەخرلێرە هەموو شتێک خوێنی لێ دەچۆڕێ، جێ پێیەکان، جێی ماچەکان، پەنجەرەکان، چنارەکان، چرادان و دەسکی دەرگاو سێبەری دارو دەلاقەو جۆگەلەوهەتا بلندگۆکەی قوببەی مزگەوتەکەش خوێنی لێ دەچۆڕێ.

دووا قۆناغی خوێندن لەو گوندە چەپەک و دابڕاوە لەژین، لەو گوندەی جگە لەکانی بێزۆکەو باڵندەو پاساری غەریب و مامۆستایانی قوتابخانەکە کەس پێیدا تێنەدەپەڕی، ئەوگوندەی شەوان لەچرادانێک زیاتر هیچ رووناکی نەدەکردنەوە، ئەو گوندەی خاڵی بوو لەئاوازو قەسیدەو قافیە، جگە لەگۆرانی کۆترو ئاوازی باران و قافیەی تک تکی دڵۆپەی بنمچی کاریتەی ژووری ساردی زستانە، دووایین لاپەڕەکانی خوێندن لەوگوندە شەشەمی سەرەتایی بوو، ئەوانەی ئەو قۆناغەیان تەواو بکردبایە، پێیان دەگوتن خوێندەوار! شکۆ لەوقۆناغەدا بوو، دووایین ساتەکانی بوو

بۆهەڵدانەوەی لاپەڕەی کتێب، دووا ساڵی بوو لەبەرامبەر تەختەڕەشەی پۆلا، رەشتر لەچارەنووسی خۆی، هەرچەند بیری دەکردەوەو تێ ی دەڕوانی، نەیدەزانی بۆ کوێی دەبا بیرەوەری و مەرگ و زامی، ساڵ دووایین ساڵەو هێدی هێدی زامەکانیش لەگەڵ خۆیدا گەورە دەبوون، ئەو حەوت ساڵ لەگەڵ دایکی و شەش ساڵیش پەیمان بۆی ببوو بەدارکاژی رێ، ببوو بە لاولاوە کەرۆح پێیەوە هەڵدەچنێ، هێدی هێدی شەشەمین ساڵی خوێندن بەسەردەچوو، تازە فێرببوو خۆڵەمێشی ووشە سووتاوەکان بخوێنێتەوە، لەفرمێسکدا باڵندەی کوژراو ببینێ، لەباغدا مەرگی باغەوان، تازە مرواری شکاوی خۆی دەبینی، فێرببوو تاریکی بۆ ئەبەد هەڵگرێ، تازە هەستی دەکرد بەحەسرەتی دەروێشانەوە عیشق بۆئەبەد لەکۆڵ بنێ، تەواو فێری نووسین ببوو و لاپەڕەی یەکەمی کتێبەکەی پڕکردبوون لەناوی دایک و مامۆستا، رۆژەکانی ئەوساڵە مەرگی دابڕانێکی تری لەنیگا دەخوێندرایەوە، بێ ئەوەی ووشەیەک بڵێن چاویان پڕبوو لەکۆڵە ڕێ، پەیمان کە لەنیگاکانی شکۆ رادەماو سەیری ئاوایی وخەڵک و گوندەکەی دەکرد، لەدایک بوونی ووشەیەک مەحاڵ دەبوو، غەمی ئەوەی بوو هاوینی ئەمساڵ چی بەشکۆ دەکا ؟ خۆری گەرم چۆن بەرچاو و روومەت و پشتەدەستی دەسوتێنێ ؟، سەراب چۆن چرای چاوەکانی کزدەکاو تەمەنی لەنێو یادگاریدا دەخنکێنێ ؟ بیرەوەری و زام و حەسرەت چۆن شەوانە بەنهێنی دەیگرێنێ؟، چۆن مەودای غەمی رابردووی بەمەتری نائومێدی دەپێوێ؟، پەیمان هەر بیری لەو رۆژانەی داهاتووی شکۆ دەکردەوە، ئاخۆ ئەو ئاگردانە هەردەسووتێ ؟ باران دەبارێ و بەهاری ئەوهەرناگات؟، وەرزی هەمووان دێ و وەرزی ئەوی تێدانیە ؟، باڵندەکانی هەمووان دێنەوە و هەرباڵندەی ئەو ناگاتەوە ؟. شکۆ دواساتەکانی ئەو ساڵەی وەک رۆژەکانی نەخۆشی دایکی دەهاتنە بەرچاو، کاتێ بەپەنجە ناسکەکانی

جەلاتینی پەنجەرەکەی کون دەکرد، تا دوایین هەناسە تەنگەکانی دایکی و هەڵفڕینی رۆحی ببینێ.

ئەو رۆژانەی دووایی بەتێڕامان لەیەک حاڵی دەبوون، شکۆ دڵنیابوو ئیترکاتی دووا سەفەری یەکجارەکی پەیمانەو دەبێ هەموو شەوێ باڵندەکانی خەیاڵی بەدواییدا بنێریتەوە شارو شەقام وقەڵاو قووببەو منارەکانی هەولێر، کەچی هەرنایدۆزنەوە، هەموو شەوێ پەڵە هەورەکان رابسپێرێ، کێ سەفەر دەکا بەرەو هەولێر؟ کێ مەنزڵگای پەیمان پێدەزانی و ئەوکۆترەی خەیاڵم بەئەمانەت لەگەڵ خۆی دەبا؟. پەیمانیش هەربەتێڕامان، لەچاوەکانی شکۆ داهاتووی کوڕە جوتیارێکی جل شپڕێو و شوانێکی رەش و رووتی بەرخۆرەتاوی کەندێناوەی بەدیدەکرد، کەڕەنگە سبەی رۆژ بەگرانە تا، یا ژەهراوی بوون بە قوومێ ئاوی ناسازی گۆماوێک، وەکو دایکی چاوەکانی لەیەک بنێ و چیتر باڵندەکانی رۆحی بەسەر باغە وێرانەکاندا نەفڕێتەوە، ئەوچەند رۆژەی خوێندن مابوو، کەسیان ئەو جورئەتەیان نەدەکرد دەست بۆ ئەولاپەڕانە ببەن کەباسی سبەو ژیانی داهاتووی تێدایە، یا وەک دوو درۆزن داهاتووی شادوومانی بۆیەکتری تەمەنناکەن، دووایین رۆژی قوتابخانە سیماکان زەردتربوون لەو ئێوارانەی کەپڕن لەتاسەی مەرگ، پڕن لەکسپەی نامورادی، پڕن لەئۆقرە بۆ سووتان، دووایین رۆژی قوتابخانە پەیمان کامێراکەی هێنابوو، تا ئەلبووم و ئەرشیفی خۆی پڕبکا لەخۆڵەمێشی مانگ، لەگوڵالە سوورەی سەربڕاو، لەباڵندەی باڵشکاو، شکۆی دەخستە بن باڵی و وێنەیان دەگرت، تا لەهەولێریش لەزوومی کامێراکەوە لەچاوەکانی شکۆ بچێتە ژوورێ و لەو باڵندانە رابمێنی کەهەر دەڕۆن و ناگەن.

شکۆ چاوەکانی لێک نەدەنا، دەیویست بە بێدەنگی هەموو دوواساتەکانی پەیمان تۆماربکا، هەموو ئەو ساتانە تۆماربکا کە بۆئەبەد وون دەبن و بۆ ئەبەدیش دەبن بەزام و دەمێننەوە.

دووایـین چرکـەکانی ڕۆیشـتنی یـەکجارەکی پـەیمان بـوو، خـەریکی کۆکردنـەوەی کەلوپەلـەکانی بـوو، لەناخـەوەش دووعـای دەکـرد شـکۆ هـیچ نەڵێ هیچ، چونکە حەرف و پیتەکانی نـاخی بۆ نەدەکرانـە ووشـە، دەیویسـت ئەوساتانە زوو کۆتایی بێ و بەدیار مامۆسـتاکانەوە ماڵئاوایی وێرانـی نـەکا، دوواتر لەهەولێری ژیان و بەسەرهات، باڵندەکانی ڕۆحی بنێریتەوەو بەسـەر پەڵە هەورەکانی کەندێناوە لەزامەکانی شکۆ بڕوانن، شـکۆ ئەوسـاتانەی لـەلا وەک یەکەم ساتی بینینی جەستەی ساردوسڕی دایکی بوو، کپ و بێدەنگ و گیرۆدەو لاڵ، لەپڕ بەنەرمی ڕوی لەپەیمان کردو گووتی: دادە.

ئیتـر ووشـەی دادە بـووە گڕکـانی گریـان و کارەسـات، چاوگـەی فرمێسک تەقین و خێرا گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی و دەرگاکەی داخست و ئەوگریانەی نەبردەوە هەولێر، دانیشت و چاوەڕوانی دووا دڵۆپی فرمێسکی کرد،

کـات نـەما، دەنگـە دەنگـی ڕۆشـتنی مامۆسـتاکان بـوو، هـەموو خۆیـان کۆکردبـۆوە، پـەیمان زەنـدەقی لەبـەردەرگای قوتابخانـە چووبـوو، دەیزانـی شـکۆ مـەرگی دوا دیـداری دەوێ، لـەوێ دوایـین وێنـەی حەسـرەتبار دەبێتـە کەسـەرو ژیـان، پەیمان ناچـاربوو ئەوچەنـد سـاتە بکاتـە پرێسـکەی زامتـرین زام، هەنـدێک جـارمرۆڤ بۆئەبـەد وێنەیـەک لێـی دەبێتـە گوللـەو هـەموو چریەکـەک دەیکـوژێ، لەگـەڵ هـەموو تروکانێـک شمشـێرێک شـەقی دەکـا، کابووسێک بانگی دەکا بۆ مەرگ و نـایکوژێ، پـەیمان لەدواسـاتی چرکانـدنی ئەو وێنەیـەبوو، دەیویسـت زوو دەربـازی بێت و سـەری بـەرز نـەدەکردەوە، خێرا سواری ئۆتومبێلەکە بوو، دەیویست زوو لەو مەملەکەتەی دەرد ڕووی تێکردوون دەربازی بێت،

شـکۆش بەهـەمان پەنجـەی کەجـەلاتینی پەنجـەرەی ژووری دایکـی پێ کون کردبوو، بۆ بینینی مەرگی دوایین بەهەشتی دایکی، لـەجامی پەنجـەرەی تەنیشت مامۆستا پەیمانی داو بەقوڕگێکی گیراو گووتی: دادە دەڕۆی ؟.

چاوه بازنەییەکانی پڕ ببوون لەئاو، پەیمان دابەزی ونووشتایەوە توند کردیە باوەشی و خۆی رادەستی گریان و فرمێسک کردەوە، کەچی ریزی ئەو فرمێسکانە ئاگری ئەوهەموو سالآنەی پێ نەدەکوژانەوە، پەیمان تێر بۆنی بێ بۆنی و رەنگی بێ رەنگی شکۆ نەدەبوو، فرمێسکەکان تێکەڵی یەکتربببوون، تا مامۆستاکانی تر هاتنەخوارەوەو شکۆیان لەباوەشی پەیمان دەرهێناو پەیمانیان سواری ئوتومبێلەکە کردەوەو گڕیاندا،

شکۆ تا تۆزو خۆڵاوی ئوتومبێلەکەی لێ بزربوو نەجولاو چاوی نەتروکاند، چاوەکان پڕبوون لەباڵندەی کۆچ، لەدووره گۆڕی غەریبان، لەئێوارەی ئەوانەی لەدەرگا دەدەن،.

پەیمانیش بوو بەسەراب، شکۆ پەنجەی یادی بەهەڵدانەوەی ئەلبوومی بیرەوەریەکانی رادەگێڕا، لەهەموو چرکەیەک بەدیار وێنەیەکەوە لەمردنی خۆی رادەما، پەڕێک نەبوو، دووان نەبوو، ئەلبومێک تائەبەد لاپەڕەکانی تەواو نەدەبوو، جارجار کەبانگی مزگەوت وەئاگای دەهێنایەوە، زوو دەگەڕایەوە ئەو رۆژانەی کەسافیەی دایکی بەدەست و چاوی تەڕی دەستنوێژەوە دەیگوت: شکۆ واوەرە لەپێش بەرماڵ و سوژدەم، نوێژەکەم لێ تێک مەدە، هێشتا شکۆ لەوێ بەدیار نوێژو نووشتانەوەی سافیەی دایکی بوو، ئەمجارە گۆرانی کۆترەکانی بنمچ و دەلاقەی خانووەکەیان دەستی یادیان رادەکێشا، بەرەو ئەودەستە میهرەبانانەی دایکی کە بەیانیان گەنمی بۆ رووەدەکردن، هێشتا لاپەڕەیەک خوێنی تەواو نەچۆڕابوو، لاپەڕەیەکی تر بیرەوەریەکانی دەهێنا، ئێواران کەچەناگەی دەخستە سەر چۆکی شەکەتی، چراو فانۆسەکانی ژوورەکە چیرۆکی خۆیانیان بۆ دەگێڕایەوە، چیرۆکی خوان و ماست و پاروهێلکەو چای بەڕەنگ، چیرۆکی ئەستوک و ئاگردانی گەرم، هێشتا لامپاکە چیرۆک و هەقایەتی شەوانەی خۆی تەواو نەگێڕابۆوە، رادیۆنەکە دەیگوت وەرە لەمن بپرسە، هەناوی من بپشکنە، چەند نامەی

ئومێدم هێناوە، چەند گۆرانیم بۆ گەنم گوتووە، بۆ دروێنە بۆ گیشەو سەپان، بۆ کاو خشت برین، بۆ ساوارکوتانی پایزان.

شکۆ لەنێو لاپەڕەکان دەگەڕاو دارو دیوارو پەنجەرەو باو جۆگەلەو پا چ بانگیان دەکرد، هەموو چیرۆکی خۆیان هەبوو، تەنها شکۆ نەبێ هیچ قسەیەکی نەبوو بیکا، بەدیار ئەوانەوە گەلای چاوەکانی بەردەبوونەوە،

بەدیار جۆگەلەی ئاو دادەما، بەدیار درەختە هەڵچوەکە، دەلاقەو کۆریت و عەمبارو جوار، بەدیار هەمووشتێک دادەنیشت و نەدەجولا، قسەوقسەرۆک پەیدابوون، گوایە شکۆ ئەجندە دەستیان لێ وەشاندیە !، هەندێک دەیانگوت شەوی سێ شەممان خۆی شووشتیەو دەیانگوت: مارەوادان ئەخر بەشەر کودەبی هەندە نەزان بی سێشەممان خۆی بشوا ؟

یەکی تر دەیگوت: بابە خیندن ئەوهایە هەمووکەسەک لێی ناکەوی شکۆ ئیواران بەدیار نان خواردن، بیرەوەریەکان بانگیان دەکردەوەو دەچوونەوە ئەوێ رۆژێ، لەپڕ دەنگێک وەئاگای دەهێنایەوە سەرخوان و نان، هەواڵ گەیشتە بناگوێچکەی مزگەوتیش، ئیوارەیەک پیاوانی ئاوایی و مزگەوت رێگەچارەی چاکبونەوەی شکۆیان خستەبەردەم باوکی،

یەکێک دەیگوت: لەتەکیەی بابەشێخ، شێتی بەزنجیر بەسترای بەپێی خۆی چویتەوە مارێ، کوڕی فەقێ رەحمان داودی بەزنجیری بەسترابۆوە، بردیانە ماری بابەشێخی، بابەشێخ یەک دووشەپی لەتەپری سەری داو کوڕە بەخۆهاتەوەو گۆتی ئەوە لۆ بەو زنجیرەی بەسترایمەوە؟، لەهەینێوە کوڕە والەمارو حارێ خۆی چ عەیبی نەمایە، یەکی تر دەیگوت: قورعان بەهەقت بەساعێبت بەخۆم لەوێ بووم، ژنەکی عازەبە هەردووچاوی کۆرە ببوو، بەیەک فاتیحەی چاوی هەریناو بەرای لێ نەما، بەمێردیشیان دا،

یەکی تردەیگوت: بەخوای ئەوبابەشێخە درۆی دەکاو هیچی راست نیە،

مەلای مزگەوت: استغفرالله، کورە وسبە کافردەبی، زوو برێ تۆبە گووم خوارد.

رۆژی دواتر، سابیر شکۆی کوڕی بەپێشەخۆیداو بەرەو گوندی ماڵی بابەشێخ کەوتنەڕێ، خوشکەکانی بەچاوی گریانەوە تاقە براکەیان بەڕێ کرد، تا لەگوندەکەش بزربوون هێشتا فرمێسک لەچاوی خوشکان ووشک نەببوو، تۆزوبای کەندێناوە چەند ئاشنابوو بەفرمێسکان، زوو زوو دەگەیشتە دڵۆپی یەکەم و لەخۆیان رادەگیرا، تۆزو خۆڵی کەندێناوە هەموو گریانەکانی ئەوێیان دەناسیتەوە، هەموو روومەتەکان، کەزی و بسک نەبوو تۆزوخۆڵی کەندێناوەی نەچێشتبێ،

شکۆش هەر بێدەنگی دەیخواردو دەیخواردەوە، لەدونیای باوەش و سۆزی دایک ون ببوو، گوڵێک بوو لەباغ جێمابوو، ئەخر ئەجندە چی دەکا لەهەناوی گوڵ !؟،

گوندەکەی بابەشێخ ئەوەندە دوورنەبوو، رۆیشتنیش لەکەندێناوە ناخۆش نیە، بەرلەنیوەڕۆ گەیشتن،

تەکیەی شێخ دیوەخانێکی درێژو بەرین، سەری کاریتەڕێژی پڕ حەسیرو شەقرە، لەدیوارەکان دەف و زەرگ وشمشێرو ئایەت هەڵواسرابوون، بابە شێخ ریشێکی پان و پۆڕی ماش و برنجی بەردابۆوە، سمێڵێکی تراشاو، بەخێرهاتنی کردن و سابیربۆ تەبەڕوک دەستی ماچ کردو وەسفی نەخۆشیەکەی شکۆی بۆکرد،

بابەشێخ تووڕەو برۆیەکانی گرژ وەستابوون، لەنزیکەوە تەمەشایەکی چاوەکانی شکۆی کردو بە دەنگێکی تورە پێی گوت: دەوت بکەوە.

تەمەشایەکی قولایی ناودەم وقورگی شکۆی کردو پاش کەمێک:هیچ نیە انشالله چاک دەبیتەوە، ئەوە لەکەینێوە ئەوهایە ؟

سابیر: مانگەک دەبی.

بابەشێخ: هیچ نیە هەندەک دەستیان لێ وەشاندیە، نەوعە ئەجندەک هەنە زۆر بێ زەمیرن، بگەنە هەرشتەکی چەپەرۆکەکی لێدەدەن یان میزەکی پێدادەکەن،

بابەشێخ دەستی خستە سەرشانی سابیرو هەندۆکەک لەشکۆی جیا کردەوەو بەچرپۆکەک پێی گووت: ئەوە دەبی فەلاقە بکرێ، هەتا ئەجندەکان بەدەویدا بچیتە دەرێ، ئەگەر نەیکەی و لێی کەون ببی، ئەجندە تەبیعاتی ئەوهایە خۆی قەیم بکا بەتۆپیش ناچیتە دەری، ئەوەندەت باش کردیە زوو هینایتت..

سابیر: بکە لەڕاهی خوای بابەشێخ، هەر ئەو کوڕەم هەیە لەسەر سێ کیژان، دەبی عیلاجەکم لێ بکەی..

بابەشێخ جامە ئاوێکی هێناو لەبەردەم خۆی داینـاو دەستی کـرد بەدوعا خیندن وبستەپست لەسەری،

بابەشێخ بەدەنگێکی گڕ: شکۆ ئەوجامە ئاوەی هەموو بخۆوە، ئەوە میقرۆب کوژە، هەناوت خاوێن دەکاتەوە، دەبی وەبکەم ئەو ئەجندەیە لەو مەملەکەتەی جێی نەبیتەوە..

شکۆی فەریکە گوڵ لەترسان بەیەک بێن جامە ئاوەکەی خواردەوە ئیدی بابەشێخی شارەزا لەفەلاقە کردن، دەستەکانی شکۆی توند بەستنەوە و سابیر بنەپێیەکانی بۆ بەرز ڕاگرتن و بابەشێخیش بەحەیزەرانان لێیدەدا، شکۆ هاواری دەکردو بابەشێخیش دەیگوت ناوەکان برێ ؟ دەی زوو ناوەکان برێ ؟

دوو کچە چاو رەشکۆڵەکانی بابەشێخ لەودیو پەنجەرەکەوە، لەکەلێنی پەردەکەوە، چاویان پڕبوو لەئاهوکەسەری شکۆ، لەپاکی و بێگەردی شکۆ دڵنیابوون، لەگەڵ هاواری شکۆ ناخی ئەوانیش وێران دەبوو وەک باغێکی سووتاو وەک خۆڵەمێشی گوڵ پڕیش دەبوون لەڕق بۆ بابەشێخی باوکیان،

شکۆهەر لەنێو بیرەوەری و خۆشەویستی پەیمانداهاواری دەکردو بابەشێخیش هەر داوای ناوی ئەجندەکانی لێ دەکرد ؟!

حەیزەران بەردەوام بوو و شکۆ بەگریانەوە: ناوی کێ برێم ؟

بابەشێخ: ئەوەی لەسەر زمانتە ؟

شکۆ بەگریان و فرمێسک و لیکاوەوە: پەیمان پەیمان.

بابەشێخ دەستی لەحەیزەران هەڵگرت و سەری بردە بن گوێچکەی شکۆ و هاواری کرد: پەیمان وەرە دەرێ دەنا بەکەلامێ خوای دەتسووتێنم و زیرەت دەبەمە عاسمانێ».

بابەشێخ بەتوندی قەلەم وکاغەزێکی هێناو بەدەست و خەتە ناخۆشەکەی نووسی (پەیمان) و بەچەرخە فتیلەکەی کاغەزەکەی سووتاند و گوتی: ئەوها ئاگرت تێبەرەدەم هەی کافری مەلعون، وەکی ئەتوو دوژمنێ بوسرمانان بی».

سابیریش لەسەر ئەژنۆکانی بنە پێیە بچووکەکانی شکۆی خستبوە نێو دەستی و لەلایەک پڕببوو لەقوڵپی گریان، لەلایەکیش دڵخۆش بوو بەسەرکەوتنی بابەشێخ بەسەر ئەجندەکانی هەناوی شکۆ !،

بابەشێخ شکۆی لەپشتی سابیر هەرداو رەوانی کردنەوە،

بنەپێیەکانی شکۆ شین و مۆر و خوێنیان تێزابوو، لەماڵەوە لەسەر جێگاکەی راکشا، رۆژی دواتر سابیر قسەی بۆ پیاوانی مزگەوت دەکردو باسی کەرامەت و شەهامەت و لێزانینی بابەشێخی بۆ دەکردن، سابیر مەڕێکی قەڵەوی کوشتەوە، نەک بۆ ئەوەی شکۆ بیخوات و هێزو توانای بێتەوەبەر ! بەڵکو کردیە خێروسەدەقە بەسەر گوندی بەخشینەوە، بەبۆنەی دەربازبوونی شکۆ لەدەستی ئەجندان !.

شکۆ لەبەر هەڵاوسان و ژانی بنەپێیەکانی ئۆقرەی نەمابوو !، ئەوجارە پیاوانی مزگەوت هەموو ببوونە تەبیب و دکتۆر، قسەیان لەسەر داو و دەرمانی شکۆ بوو !، شکۆش بەقونەخشکەو نووزە نووز هێدی هێدی بەرەو

چاکبوونەوە دەچوو، بابەشێخ دەرسێکی وەهای پێدابوو، نەدەوێرا چرکەیەک دابمێنێ و لاپەڕەی بیرەوەریەک هەڵداتەوە، مەگەر شەوانە درەنگ، لەبنمیچ و تاریکی ژوورەکەدا بەنهێنی و زۆر نهێنی، سافیەی دایک یانیش پەیمان لەیادێکدا سەردەربێنێ.

شکۆ بەیەکجاری بنەپێیە فەلاقە کراوەکانی چاک بوونەوە، بەڵام بابەشێخ بووە بەشێک لەئازارە کوشندەکان و زام، بووە بەشێک لەو زوڵم و ستەمەی کەهەرزوو یەخەو بەرۆکی تەمەنی شکۆیان گرتبوو.

سابیر بیست و پێنج مەڕی کڕی و شکۆی لێ کردن بەشوان، ئیدی پێنج مەڕی ئەو جیران و سێ ی ئەولاشی بەکوتە دەبردن لەگەڵ خۆی، دەموکات بەدیار لەوەڕاندنی مەڕومالاتەکانی بوو، شوێن بناری قەرەچووغ، بناری خەم و وەسەرهات، بناری پڕ لەکارەسات، هێشتاکە ترسی نەشکابوو، نەدەوێرا کۆتری خەمەکانی هەڵفڕێنێتەوە بەرەو باغی بیرەوەریەکان، نەدەوێرا ئەوکتێبە بکاتەوە کەپڕبوون لەئەلف و بێی پەیمان، نەدەوێرا بەنیگایەکی سەرپێی یادیش، سەرێک بداتەوە لەژوورەکەی مامۆستا پەیمان و بەدیار ئەوعەسرەوە دابنیشێ و سەیری خۆی بکاتەوە کاتێ پەیمان لەنێو تەشتەکەدا سەری دەشووشت و جلە نوێیەکانی لەبەردەکردن، نەدەوێرا دەرگای ئەو بتخانەیە بکاتەوە، نەدەوێرا لەپەنجەرەی یاد بڕوانی، چ شەڕێک بوو شکۆ لەگەڵ خۆیدا دەیکرد !، حەزی دەکرد ژەهر بخواتەوەو لەترسی زام نەدەوێرا، حەزی دەکرد غەم سەری بخواو لەترسی غەم نەدەوێرا، مەتارەیەک ئاو بەنێوقەدیەوە بوو کەهەرگیز تینوێتی نەدەشکاندن، گۆچانێک بەدەستیەوە کەهەرگیز نەدەبوونە هاوڕێی پێیەکانی، شەرواڵێکی شڕو جوتێ پێڵاوی چوپلێس هەموو سەروسامانی بوون، هاوینی گەرم سەری کەپوو و روومەتەکانی قەرەشتی کردبون، پشتە دەستەکانی شەق شەق و قلیشاو، لێوەکانیشی لەبەر تەریفەیی و ماندوێتی شەقاری بچووکیان گرتبوو، ناو شەقارەکانیش خوێنی رەقیان تێدابوو، بن نینۆکەکانی رەش ببوون لەگەڵ

ڕۆژگاری ڕەش، شەرواڵێکی بۆری تۆزاوی دڕکە زەردەی گرتبوو، جارجار لەگیرفانەکانی پەلکە نانێکی دەردەیناو دەیجوین، کراسێکی کۆن کەرەنگی جارانی خۆی لەبیرچووبوو، سەردەستەکانی دڕاو و پشتملەکانی چرکاوی، سەرو پرچە ڕەشەکانی درێژببوون و زوزو دەکەوتنەوە پێش چاوی و بەدەستێک لای دەبردنەوە، سێزدە ساڵی تەواو کردبوون و پێی دەنایە چواردەوە، دەمەو ئێوارەیەک کەخۆر خەریکی چاو داخستنی بوو، هێدی هێدی مەڕەکانی لەپێشیەوە دەچوونەوە، لەدوورەوە سێ کەس بەرەو پیری دەهاتن، هێدی هێدی نزیکتر دەبوون بەڵام هەر ڕوون نەبوو کێن !، شکۆ پرچە درێژەکەی لەسەر چاوی لادەبردن و تێ ی دەڕوانین، پەیمانی ناسی و گۆچانەکەی فڕێداو خێرا وەک (با) خۆی کرد بەباوەشی و کانی چاوەکانی تەقین و فرمێسک بەسەر ڕوومەتە قلیشاوەکانی ڕیزیان بەستا، پەیمانی هێنایە کوڵەکوڵ، دەمێک بوو هێشتا نۆرەی قسە نەهاتبوو، شکۆ دەیویست قسەبکا بەڵام زامەکانی ئەوەندە قوڵ بوون زمان نەدەهاتنە گۆ، پەیمان عەوجەی پرسیارکردنی نەبوو، سەرو سیماو بەرگ و پێڵاوی شکۆ هەمووی وەڵام بوون،

دووای ئەوەی فرمێسک سڕانەوە،

پەیمان بەگریاناویەوە: شکۆ دیارە بوویتە شوان ؟.

شکۆ: بابم ئەو مەڕانەی کڕی و گوتی دەبی بچیە بەریان.

پەیمان: پێی دڵخۆشی ؟ ئاسوودەی ؟

شکۆ بەدەستێک فرمێسکەکانی سەر ڕوومەتە قلیشاوەکانی سڕینەوەو بەگریانەوە: ناوەڵا، گەلەکم پێ خۆشە بمرم، بەخۆشم نازانم لۆچ دەژیم !، ناوێرم فکریش بکەمەوە دەرێن شێتەو دەمبەنە ماری بابەشێخی و فەلاقەم دەکەن،

شکۆ باسی بەسەرهاتی فەلاقەی بابەشێخی بۆ پەیمان گێڕایەوە،

پەیمان هەناسەیەکی پڕ هەنسکی هەڵکێشاو: دەتەوێ خوێندن تەواوبکەی ؟ حەزدەکەی لەهەولێر لەلای من بی تاخوێندن تەواو دەکەی و دواتر بگەڕێیتەوە ئێرە ؟.

شکۆ: ئا، زۆرم حەزلێیە ببمە مامۆستا ئەوجە بێمەوە ئێرە.

پەیمان: زۆرباشە توو زیرەکی و دڵنیام سەرکەوتوو دەبیت، لای کەس باسی مەکەو من چەند رۆژێکم لێرە ماوە، ماوەی خۆم تەواو کردوەو بەیەکجاری دەگەڕێمەوە هەولێر، هەموو شتێکت بۆ رێک دەخەم و دەڕۆین، بەڵام رەنگە باوکت بزانێ رێگەت پێ نەداو قەبوڵ نەکا، هەفتەی داهاتوو وەرەلام».

شکۆ هەموو ساتێک و چرکەیەکی دەژماردن، رۆژ لای ببوو بەمانگ، گەلەک دڵخۆش و پەرۆش بوو بەوهەواڵەو پڕببوو لەئومێد، وەک درەختێکی تینوو جۆگەلەی ئاوی بۆ راکێشرابێ، دوای سێ رۆژ ئێوارەیەک خۆریش خەریکی پێچانەوەی خۆی بوو دیوارە سواغ دراوەکانی ئاوایی زەرد کردبوون، سۆفی و نوێژ خوێنەکانی مزگەوت خەریکی دەستنوێژ بوون، قازو مریشک و عەلەشیش بەرەو کوریت و سەرکاریتەکانیان دەچوون، شوان گەڕابوونەوە حەسار، شکۆ بەپارێزەوە خۆی گەیاندە ژووری مامۆستا پەیمان و بەدوای هەواڵی هەتوان و سەفەری یەکجارەکی و خەون و ئومێدەکانی دەگەڕا».

پەیمان پێی گووت رۆژی پێنج شەم کاتی نیوەڕۆ، ناسنامەکەت لەبیرمەکەو لەسەرجادەی گشتی خۆت پارێزکە تا ئێمەش دێین و لەوێ ئوتومبێلی مامۆستایان بەوێدا تێدەپەڕێ».

شکۆ پڕبوو لەشادی و بزەو زەردە، چاوەڕوانی چەقی ئەو نیوەرۆیەبوو، وەک چۆن قافڵە بەخۆشیەوە دەگەنە نزیک ئاوەدانی،

ئەو رۆژە بەهەنجەتی ژانە زگ، پێش نیوەڕۆ مەڕکانی هێنایەوە و بەخشکۆکە بەرەو جادە گشتیەکە خشی، پێشترئەوەندە لەگەڵ مامۆستا

پەیمان چووبووە سەرجادەکە، دەیزانی لەچ بستێک رادەوەستن، پاش کەمیک پەیمان و سێ مامۆستاکەی تریش هاتن و چەند ساتێکی تریش ئوتومبێلی مامۆستایان هات و هەمووان سەرکەوتن، شکۆ بۆ دواجار لەپەنجەرەکەوە پەرچەمی پێش چاوەکانی لادەداو دەیڕوانیە گوندو قوببەی مزگەوت و قەبرستان و هەیوانەکەی خۆیان، سەیری سەروچاوەی زولالی کانی بێرۆکەی دەکرد، کەبەجۆگەلەوە شۆڕدەبۆوە باخچەکەی سافیەی دایکی، دەیڕوانیە حەوش وحەسارەکەیان کەسافیە گورج و گۆڵ تێیدا دەهات و دەچوو، چاوی نەدەتروکاند، وەک چۆن بولبول دەنووک بەباغەوە دەگرێ، شکۆی نووشتاوەی غەم و وەسەرهات، هێشتا زوو بوو بۆسەفەری راگوزەری دوور وڵات،

هێشتا زوو بوو بۆ لەت بوون وبۆ شەق بوون و دابران، هێشتا هێسکی ناسک بوو بۆگلان و ترازان و هەندەران.

ئیتر ئاوایی لێ وون بوو، خەمی چاوەروانی خوشکەکانی خورپەی لەهەناوی هێنا، پرسیارێک هاتە گۆێ ی و پێی گووت: هێ پیییی شکۆ، نازانی خوشکەکانت ئیستا چاوەڕێتن ؟، ئەگەر نەگەڕییتەوە ئەوان رەنگە لەتوو زیاتر کەسیان نەبێ، نازانی توو تاکە رووناکی داهاتووی ئەوانی ؟.

شکۆش لەناخەوە: کەبوومە مامۆستا دەچمەوە، داکیشم هەردەیگۆ دەبی ببیە مامۆستا، لەگوندی چ بکەم ؟.

پەیمان وەها شکۆی خستبووە بن باڵی، وەک ئەوەی لەهەناوی خۆی بووبێ!، گەیشتنەوە هەولێر، ئەوشارەی کە شکۆ تەنها لەپەیمانی بیستبوو!، لەدیدو چاوەجوانەکانی شکۆ هەمووشتێک تازەبوو!، شەقام، شۆستە، خانووی بەرزو جوان و دەرگای رەنگین و نەخشکراو، لەهەندێک ماڵ دارتووێیک لەسەر دیوار کەزی وبسکی هەلکێشابوو، گەڵای زەردی پایزانەیان لێ رژابوونە دیوی دەرەوە، لەدەرگای حەوشەی ماڵی پەیمان چوونە ژووری، بەبەراورد لەحەوش و حەساری ماڵی شکۆ، حەوشێکی

بچووک بوو !، هەموو شتێک بۆ شکۆ یەکەمجار بوو !، دەرگای ژوورەکان، پەنجەرە بەنەخشەکان، ژووری نان خواردن و بەفرگرو تەلەفزیۆن، ئەخر لەوێ تەنها رادیۆنێکی هەیەونیە هەبوو، دیاربوو مامۆستا پەیمان پێشتر لەماڵەوە باسی شکۆی کردبوو، هەربۆیە هەموویان لێی کۆبوونەوەو ماچیان دەکردو پێی خۆشحاڵ ببوون، شکۆ سەیری هەمووانی دەکرد، خۆشەویستی ئەوان خەمەکانی شکۆی رەواندبوونەوە، لەپڕ بانگی (اللەاکبر) ی مزگەوت، رایچڵەکاندو پەلکێشی کەندێناوەی کردەوە، ئەو رۆژانەی باسکی سافیەی دایکی ئاوی دەستنوێژی پیدا دەهاتنەخوارێ و بەرەو پەشتەمارەکەی دەچوو، دڵۆپێک فرمێسک وەک ئاوی دەستنوێژەکەی دایکی، ویستی روومەتی بشواتەوە، بەڵام لەترسی ئەوانەی دەوروبەری، خۆی دەرباز کرد لەو بوومەلەرزەیە.

هەمووان دەوریان لەشکۆ دابوو و پێیان دەگووت ئیدی تاخوێندن تەواو دەکا کوڕی خۆمانە.

ئەوان خێزانێکی ئارام و ئاسوودەی هەولێری بوون، باوکیان نەمابوو، دایک و سێ خوشک و برایەک پێکەوە دەژیان، دایکیان لەهەمووان زیاتر بەشکۆوە دڵخۆش ببوو، پەیمان لەدوو خوشکەکەی تری گەورەتربوو، براکەشیان فەرمانبەربوو، هەر زوو ژوورێکیان بۆ شکۆ رێک خست.

هەر زوو شێوەی شکۆ بەتەواوی گۆڕا !، نە ئەو شکۆیەی جاران!، پرچێکی درێژ دەهاتەوە نێوچاوی، نینۆکەکانی پڕ قرێژ، روومەت قەرەشتی و پشتەدەست قلیشاو، خۆری گەرمی هاوینی کەندێناوە نەک هەر روومەت و دەستەکانی ! گوێیەکان و پشتەملیشی رەش کردبوون !، شکۆ بەتەواوی گۆڕا، شەرواڵە کۆنەکانی فڕێدرانە تەنەکەی زبل و بەرگی خوێندن و ماڵەوەو دەرەوەی بۆ کرا، کتێبی تازەی وەرگرت و گەڕایەوە خوێندن، قلیشانی دەست و پەنجەو روومەتەکانی هێدی هێدی ئاسەواری نەما، گەنمە رەنگی گەڕایەوە، لەگەڵ کتێبەکان و خوێندن ببووە دۆست، ئەوانیش

دەرسیان پێ دەگووت و تەواو ئاشنایی یەکتر ببوون، ڕۆژانی هەینی هەموو لەماڵەوە دەبوون، لەدەوری شکۆ کۆدەبوونەوەو باس و خواسی ژیان دەستی پێ دەکرد، شکۆش ناخۆشترین ڕۆژەکانی هەینی بوو، ڕەوە باڵندەکان دەهاتنەوەو نامەیەکیان لەگەڵ خۆیانا دەهێنا، وێنەیەکی ئەلبوومی ئەوێی تێدابوو کاتێ لەگەڵ خوشکەکانی سەردانی سافیەی دایکیان دەکرد لەگۆڕستان، شکۆی لەخوێناوی یاد وەردەدا، ژەهری مەرگ بەدەماری ناسکیدا دەسوڕانەوە، ئەوان قسەیان بۆدەکردو ئەویش لەناخەوە لەدونیای مەرگ و ژیندا کوڵەکوڵی بوو، نەیدەهێشت کەسیان درک بەو پەنجەرەیە بکەن کە بای مەرگی لێ دەهات، نەیدەهێشت کەسیان بزانن ئەو لەگەڵ بانگی مزگەوت سەدجار دەمرێ و دەژییەتەوە، بە بزەوخەندەیەک هەمووانی دەخەڵەتاندو گڕی مەرگی دەشاردەوەو لەگەڵ خەندەکانی ئەوان دەگەشایەوە، هەمیشە باڵندەکانی دوێنێ و ڕابردوو لەپەنجەرەیان دەداو مەرگە چیرۆکیان بۆ دەهێنا، پۆلێک دەهاتن و پۆلێکی تری بەدواوە بوون، هەریەکەو یادێکیان پێ بوو، هەریەکەو باسێکیان پێ بوو، شکۆ دەیویست پەنجەرەیان لێ نەکاتەوە، گوێ لەدوێنێ نەگری و لەگەڵ ئەمڕۆی بژی،

ئیدی ململانێ دەستی پێ کرد، ئەو پیادەو ڕابردووش سوار، ئەو کارە کۆرپەیەکی کێوی و یادەوەریش گەلە گورگێکی دەم هار

ئەو سەرێکی هەزار کون و کەلەبەر، پڕ لەباڵندەی موسافر، هەموو ڕۆژ خێرا دەگەڕێنەوە کەندێناوە، بۆ هێنانەوەی چیرۆکی مەرگ و بیرەوەری،

کاتێ شەوان، شەوانی بێداری و سووتان، دەرگای ژوورەکەی دادەخست، تا تێر بگاتە قولایی خەراباتی خەم، تا ئەو باغانەی درک یەخەی گوڵیان گرتووەو تارایی ژەهریان لەسەرناوە، شەوان ئەوەندە لەگەڵ باڵندەکان دەگەڕایەوە کەندێناوە، جەستەی ئەوەندە هێمن دەبوو! ڕووناکی

ژوورەکەش نەیدەبینی!، زەوی درکی بەقورسایی نەدەکرد ! هەموو شەوان کاروان سەرای کەندێناوە، پارچە شکاوەکانی رۆحی شکۆیان دەبردەوە،

دەرگای حەوشەیان لەسەرپشت بوو !، ئەخر خەرمان و شیلان و چنار هەموو شەوی لەچاوەروانی شکۆدا دەرگا شرەکەیان دانەدەخست، نەبادا شەوێک لەدەم کەڵبەی گورگ قوتار بووبێ و بگەڕێتەوە، ئەوەندە بەهەستەوە دەنووستن، نەبادا لەپەنجەرەکە بداو بڵێ دەرگەم لێ بکەنەوە من نەمردووم،

شەوانە شکۆ کەسەری دەکردە سەر بالیفەکە، پرێسکەی پرسیار دەبوونەوەو پرسیار پرسیار پرسیار،

کەی دەگەڕێیتەوە سەر گۆڕەکەی سافیەی دایک و لەبەردەمیا دەنووشتێیەوە ؟ باسی ئەو سەفەرەی بۆ دەکەی و پێی دەڵێی پەشیمانم ؟، پێی دەڵێی مەرگی تۆ هیچ شوێنێکی ئارامی بۆ نەهێشتبوومەوە،

کەی لەدەرگا شرەکەی باوکت دەدەیت و خێرا دەستی ماچ دەکەی و پێی دەڵێی بمبوورە کەچاوەڕوانیت کردووم،

خەیاڵ هێشتا هەنگاوی دەناو نیوەرۆیەک دەگەڕایەوە سەر خوانی ژووره کاریتەدارەکە، هێشتا قاپە فافۆن و مراکە بەنەخشەکەی خۆی دەناسینەوە،

ئیوارە زستانەی گوندەکەیان، جوتیاران لەلاپەڕێک دەست لەبەر پشدێن، خۆیان دەدایە خۆری دەم کەلی ئاوابوو، باسی گاسن و باران و هات و نەهاتیان دەکرد، باسی داس و بەیارو تەبارەی پاریان بوو،

بۆنی بنارو تاشەبەردو تەپۆڵکەکانی قەرەچووغ لەدەماری ناسکیدا دەسوڕانەوە، سەرجۆخینان داوای رۆینی پییەکانیانی دەکرد، هێدی هێدی یادو بیرەوەری ریگەی خوێندنی لێ دەگرتن و ئاگای لەمامۆستاو سەرتەختە رەشەی پۆل نەدەما، هەولێری جوان و شەقام و شۆستەو خانووه بەرزەکان، نەوی نەوی بوون لەئاست خەمەکانی، غەریبی کۆڵانە

قوراویـەکانی زسـتانی ئـەوێی دەکـرد، دڵۆپـە بارانـەکانی هـەولێر بـۆنی کەندێناوەی لێ نەدەهات و نە هەورەکانیش وەک هەوری ئەوێ سەریان بەقەرەچووغ دەکرد، هێدی هێدی غەریبی هۆشی لێ دەبردن، کەبەهار فەرشی سەوزی لەراستایی کەندێناوە رادەخست و گوڵە عاجیلەو نیسانیشی پێـوەدەکردن، کیژوکـار کۆمـەڵ کۆمـەڵ دەچوونـە کـەنگرو کـاردی و دەسکەچنەی تۆرکان، ئێوارانیش بەشەکەتی دەگەڕانەوەو شێمە عۆپەش تەرازووی دانابوو لێی دەکڕین و سبەینێ گەردی بەیانیان لەگەڵ مەنجەرە ماستە سەربەقەسەرەکان بەجێبە درێژەکەی دەیبردە بن قەراتێ هەولێرێ دەیفرۆشت و خێرا دەگەڕاوە، کیژوکار پارەیان دەگرت و سەرپۆش و کراس و هوردەوارەیان لەدێوەرەی پێ دەکڕی،

هێشتا غەریبی شکۆی دەهاری و دەیبردەوە شەوانەی هاوین و چاوشـلکانی و خۆشـاردنەوە، نەدیـدەزانی رۆژێـک بەیـەکجاری خـۆی دەشارێتەوەو ناگەڕێتەوە، غەریبی شەوانی پڕ ئەستێرەو تریفەی سبەینانی جەژن، کەدایکی دەنووشتایەوەو یەکە یەکە ماچی دەکردن، ئەو ماچانە مولولـەی دەمارەکـانی فرمێسـکی لـی بـەگۆڕی وەردەکـردن، غـەریبی کوکوختیەکانی سەر دیوارە قوڕەکانی پاش عەسر کەبەخوێندن خەم و چیرۆکی پڕحەسرەتی گوندە چەپەکەکەی دەچڕاند، غەریبی ئەو پاساریە شەیدایانەی کە دەڕژانە نێو حەوشەکەیان، دەیویست بانگیان بکاو پێیان بڵی ئێوە هاوگوندی منن خۆشم دەوێن، غەریبی چیا سەرکەشەکەی کە گوندەکەیان پاڵی پێدابوو، کەدڵبەندی و سەرفرازیی بوو، غەریبی ئەو مریشک و جوچکەو بارکانەی کەبەدوای سافیەی دایکیدا دەچوون بۆ گەنم، شکۆ لەگەڵ غەریبی بە نێو دۆزەخی ئاگر لەڕۆح بەردانیدا تێدەپەڕین، غەریبی ئەو دەنگە میهرەبانەی کەپاش عەسران دەچوە دەرێ پێی دەگوت: کوڕم ئاگات لەخۆبی لەبیرێ عەلیۆکی نێزیک نەبیەوە، قەناتی نیە، نازانم لۆ شوورەکی لۆناکەن !،

غـەریبی ئـەو سـوونەتکەرانەی دەهـاتن و منـداڵی گونـدیان سـوونەت دەکردو پاشـان دایک و باوکیـان چوکلێت و لوقمیـان دەبەخشیەوە، غـەریبی کۆلارەی پەڕەگاو ئاسمانی منداڵان، غـەریبی رسـتەو تـەنافی جل و بـەرگی حەوشـە، غـەریبی دوکانـە قوڕینەکـەی قوڕنـەی مـام شـەوکەتی وجـاغ کۆر، غـەریبی ئـەو مشـکانەی تێیدا جریت و فریتانییـان دەکردو مـام شـەوکەتیان توڕەترکردبوو و منداڵیش زیاتر دەپریقانەوە، غـەریبی گـەردەلوول کـەدەهات و هەموو چاوی خۆیـان دەگرت و دەیـانگوت چاوتـان بگرن نـەوەک ئەجندە دەکەوتـە چاوتـان، غــەریبی دار غــەریبی بــەرد، غــەریبی کــەرو دۆراب و گوریس کەئاویان پێ لەقەنات و بیری دەردەینا، غـەریبی جوار غـەریبی کاو کادین وکوزرو کوندەران، غـەریبی ناندینـە رەش و دوکەڵاویەکـەو ئاگردان، غەریبی ئەستووکە بەشەکر، غەریبی برێشکە غەریبی ماست.

غەریبی وەها وێرانی دەکردو چۆکی پێدادەدا، لەچاوەکانیدا دەرژانەوە، ئاگـای لەدەرسـەکان و مامۆسـتای نـەمابوو، وەک بـەردێک لەبەرامبـەر تەختەرەشە، حەسرەت و بیرەوەری هەرجارەو بەرەو رۆژێکی کەندێناوەی دەبردەوە، غەریبی هەموو شتێکی لێ سەندبۆوە، زوو زووش مامۆستاکەی وەئاگـای دەهێنایـەوەو پێی دەگوت: کـوڕم وریـایی دەرسـەکە بە، گێ لـەمن بگرە، لۆ ئەوەندە زەینت دەڕوا ؟.

شکۆ بێدەنگ دەبوو، زمـانی گیـرۆدەولاڵ، حەسـرەت و مەینـەت بـاری سەری گێژ کردبوون، کەدەگەڕایـەوەش بەخـەندە درۆیینـەکانی نەیدەهێشت پـەیمان و ئـەوانی تـر درک بەمـەرگی رۆژانـەی بکـەن، هەنـدێک جـاریش چاوەکانی ئەو نهێنیەیان پێ نەدەشاردرایەوە.

سـاڵ بـەنیوە هـات، شـکۆ لەدەرسـەکانی دەرنـەچوو، غـەریبی کـۆت و دیلی کردبوون، بەلام شەرمەزاریەک هەموو جەستەی داپۆشی، نەیدەویست پـەیمان ومالـەوەیان بـزانن، نـەبادا پرسـیاری لـێ بکـەن و نهێنـی غوربـەتی ئاشـکرابێت، شـکۆ هەسـتی بەشـەرمەزاری دەکـرد، لـەپای ئـەو هـەموو

ماندوبوونە دەرنەچوو و سەرکەوتوو نەبوو!، پێویستی بەبڕیارێک بوو !، هەربڕیارێک بێ ! گرنگ ئەوان نەزانن لەخوێندن شکستی هێناوە، ئەوان نەزانن رابردوو سەری خواردووە،

زەنگ لێدراو هەموو گەڕانەوە پۆلەکانیان، شکۆش بەهەنگاوە شلەکانی، مامۆستا هاتە ژوورەوەو پێی گوتن دایک و باوکتان ئاگاداربکەنەوە بەیانی سەعات (دە) بێنە ئێرە، کۆبوونەوەیان لەگەڵ دەکەین و باسی تواناو ئاستی هۆشیاری ئێوەیان پێ دەڵێین. ئەو هەواڵە بۆ شکۆ گوللەیەکی کت و پڕبوو، هەموو برینەکانی بەیەکجاری هەڵوەشاندەوە، ئارەقەیەک نێوچەوانی تەڕکردن، دڵنیابووئیتر شاردنەوەی ئازارەکان کۆتایی هات و سبەی بوومەلەرزەی وەسەرهات هەڵدەقوڵێ،

دەنگێک لەناخیا پێی گوت: بگەڕێوە، خێرا بگەڕێوە لای خوشک باوکت و گوندەکەتان،

ئەخر برێم لەکێ بووم ؟ لەگەکێ رۆیشتم ؟ مامۆستا پەیمان ئەوەندە لۆم باش بوو، برێم مامۆستا پەیمان ئەمنی برد ؟ نانا، ناچمەوە، بچمەوە هەر بابم دەمکوژی، دیسان دەمباتەوە کن بابەشێخی و بنی پێم دەتورێنتەوە، بەخوای ناچمەوە،

زەنگی کۆتایی دەرسەکان وماڵەوە لێدرا، شکۆ کتێبەکانی لەنێو کورسیەکەیدا بەجێهێشت و بۆ دووایین جار تێنووس و دەست نووسەکانی داخستنەوە، بێ ئەوەی خواحافیزی لەهاوپۆلەکەی تەنیشتیشی بکا، دوایین ئاوڕی دایەوەو بەهارێکی تری بەجێهێشت، وەک هەموو ئەوانەی جێی هێشتبوون،

سەر شۆستەیەک هەنگاوە شلەکانی دەژماردن، نەیدەزانی بەو ئێوارەیە بۆکوێی دەبەن،

پرسیاری لەخۆی دەکردو دەیگوت: کو بچمەوە ماڕێ مامۆستاپەیمانی ؟ چ برێم ؟ جلک وبەرگ و رۆژانەو ماندیبوون، هیچیشم بەهیچ نەکرد، قەت

نابی بمبیننەوە، ئەدی چ دەکەی ؟ شەوێ لەکێ دەبی ؟ ئەلعان دەمەشکە عالەم دەچنەوە مارێ خۆیان، بەتەنێ دەمینیمەوە، هەی عەمرت نەمینێ ئەتوو بەتەنێ لەچیاو گەریان مەرِت نەدەلەوەراند؟ چ ترسیشت نەبوو.

پشتی دایە دیوارێکی روو لەخۆر، گۆرەپانێکی بچووکی لەبەردەم بوو، نزیکە بازاڕو دەنگەدەنگ، جارجار هەسپی خەیاڵ دەیبردەوە کەندێناوەو هاواری دەستگێرێکی کاسبکار دەیهێنایەوە پیرە هەولێر، گەرمایی تیشکی خۆریش دەم دەم دەیبۆرژاند،

بەرەو هێوارەیەکی ساردوسڕی بێ هیوا، هەندۆکەک لەودیوی گۆرەپانە گچکەکە، چایەخانەیەک جممەی دەهات، کەپرێکی حەسیروداری لەپێش بوو، سۆبە داریەکی ماقولی لێ هەڵکرابوو، بۆریەکی درێژی تێهەڵکیشرابوو و دووکەڵی لێ دەهاتنەدەر، ئەولاو ئەملای سۆبەکەش کۆمەریان لێ کردبوو، هەموو جل شپڕێو و سیما ماندوو دیاربوون، خۆیان لەبەر گەرم دەکردەوە، هەندێک دەلینگی شەرواڵیان دڕابوو هەندێک سەردەستیان، کزکز دانیشتبوون بەدەوری، ئەوێ مەیدانی کرێکاران بوو، دیاربوو ئیشیان دەستنەکەوتبوو، بێ چارەیی هێدی هێدی شکۆی لێ نزیک کردنەوە، ئەوان دووکەڵی سۆبەکەو هەژاریان پێوەدیاربوو، بەلام بێ خەندەو ئاسوودەییش نەبوون، تا دەهات رۆژ ئاوادەبوو و یەکە یەکە دەڕۆیشتن، دوایین پارچە داری نێو سۆبەکەش قرچەقرچی بوو، هێواش هێواش خاوەنی چایخانەکەش کەرەستەکانی دەبردەوە ژۆرێ، ئەوەی کەمابۆوە کوپپەیەکی ئاو و کەچە مێزێک و کورسیەکی درێژ نیمدەرەیەکی لەسەر بزمار رێژکرابوو، پیاوە چایچیەکە غرڕەی لە دەرابەکەی هێناو لەبن پێی خۆی ناو کلیلیداو سووک سووک رۆیشت، شکۆ خۆی گەیاندە سۆبەکەو دیاربوو هێشتا گەرمیەکی باشی تێدامابوو، لەبن کەچە مێزەکەش پارچە کۆلکە هەبوو، شکۆ شواناتی کردبوو، یەک دوو کۆلکەی هێناو ئاگرەکەی خۆشتر کردەوەو خۆی پێ گەرم کردەوەو لەسەر کورسیە

درێژەکەش لێی راکشا، خەیالیش لەدەرفەت دەگەڕاو شکۆی کەمۆ کردبوو، پرسیار هیلاکی دەکردن !، ئەگەر بگەڕێتەوە گوندەکەیان چی بڵێ ؟ وەڵامی ئەو شەش مانگە بی سەروشوێنیەی چۆن بداتەوە ؟.

جادەکەش هێدی هێدی چۆڵتر دەبوو و دەنگی قەرەباڵغی تەواو کەم ببوو، دونیا تەواو تاریک ببوون، چوارپێنج قوتکە سەموون و رۆخە نان لەسەر مێزەکەبوون، سەرما نەیهێشتبوو هیچی تخون بکەوێ، یەک یەکی رادەکێشان و دەیجوین و قووتی دەدان، شەو راشکاو کەم کەمە پارچە داری لەسۆبەکە دەکردو بەلام هێشتا سەرما کورژەی پێ دەکرد، دونیا کش ومات ببوو، خەو دەستی رادەکێشایەوە دونیایی بێ ئاگایی، درەنگی شەو لەگەڵ بۆرە بۆڕی پیاوێک خەبەری بۆوە، لەبەرامبەر چایخانەکەو لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکە هاواری دەکردو دەیگووت: بەوەلاهی بەوەلاهی بەوەلاهی دەبی بەمیزەکەم بنووسم (مایکل ) ، مادام سیقەت پێم نیەو بەقەردم نادەیێ هیچ عیلاجت نیە، دەبی بەو میزەی بنووسم مایکل، سەگبابی ئاوها چارێکە ئارەقێکی لەمن چاوە،.

کەسێک تارمایی دیاربوو، بەولاتر تێپەڕی، دیاربوو رووی لەویش کردو پێی گووت: برا بێ زەحمەت وەرە دەمەوێ بەمیزەکەم بنووسم مایکل، نیوەم نووسیوەو میزم پێ نەماوە، توخوا وەرە بۆمی تەواوکە، کابرایی ئەوبەریش لەو سەرخۆشتر بوو و گووتی: بەخوای دەهاتم بەس ئەمن خیندەواریم نیە،.

شکۆ هەوڵیدا خۆی نەجولێنێ و سەرخۆشەکە نەیبینێ، بەلام دیاربوو سەرخۆشەکە شارەزایی چایخانەکەبوو و چاویدایە سۆبەکە و رێک لەتەنیشت شکۆی دانیشت، دونیا ئەوەندە تاریک بوو و شکۆش هەستی لەخۆی بڕی، هەندەی نەبرد سەرخۆشەکە شکۆی بینی و چاوی لێ تیژ کردەوەو پێی گووت: ئەتوو نەبووی قاپە شێلمەکەت لەپێشم برد ؟.

شکۆ: شێلمی چ، ئەمن لەکێ ئەتووم دیتیە ؟.

سەرخۆشەکە: دەوەرە باپیکەوە بنووین، خەوت نایە ؟

شکۆ بەترسەوە سوڕایەوە پشت کەچە مێزەکە، سەرخۆشەکەش تەواو نیەتی خراپ بوو و لێی دەهاتە پێش، شکۆ چارەی نەماو پاڵێکی توندی پێوەناو بەسەر سۆبەکەیدا بەرداوە، بۆڕیەکەی سەرەوە لەسەرڕا هاتەخوارێ و سۆبە دەم نخون بوویەوەو مێز وەرگەڕاو کورسیەکە کەوتە سەرپشت، سەرخۆش و سۆبەو بۆڕی و کورسی و مێز تێک گیر بوون، سەرخۆش دەینەڕاندو هاواری بوو و دەیگوت: مایکل و بۆڕی و سۆبەو کورسی گەوادن، شکۆی چوست و چالاک لۆی دەرپەڕی و ئەوناوەیەی بەجێهیشت و سوڕایەوە جادەیەکی تر کەهەموو ریزە دووکان بوون، دەیویست هێشتا زیاتر دوورکەوێتەوە و دلنیابێ، دەرگایەکی گەورەی دوودەری لەپەرژین و سەردەرەی رۆناکاییەکی لێ دەهاتەدەرێ، دەرگاکە کەمێکیش قووڵ بوو، دووسێ قاندرمە شۆڕببۆوە و ببووە پەنا، شکۆ پشتی پێ داو خۆی لێ مات کرد، دەرگاکەش بەو زستانە گەرمایی هەبوو!، دیاربوو بەوشەوە درەنگە دەنگەدەنگیش دەهات !، ئاگرەک بڕڕڕەی دەهات و قاپ و مەنجەریش تەقەتەقیان بوو، هەندەی نەبرد مەلا کەباری داو مکەبیرەی مزگەوت سەرای کێشا، لەپڕ پیاوێکی بەتەمەنی سەرووپرچ سپی دەرگاکەی کردەوەو چاوی کزی لەشکۆ روون کردەوەو گووتی: کوڕم ئەتوو چ دەکەی لێرە ؟ بەوشەوە ساردو سەرمایەو دنیاخرابوونەی !؟.

شکۆ بەلێوە سەرمابردووەکەی: دەمەوێ رۆژهەرێ و دنیا رۆناک بی، هیچ جێم نیە بچمێ.

پیاوەکە شکۆی هێنایە ژوورێ و هۆلێکی درێژو یەجگار گەورە ! لەنێوانیا ناوبڕەیەکی دیواری نەوی بوو، چەند دەزگایەکی ئاسن کە دوو پرێمزی گەورەی لێ چووبوونە ژوورێ و لەشێوەی کورەیەکی گەورە بوو بۆ تواندنەوەی فافۆن، پاچە فافۆنی گەورەیان دەخستە ناوی و دەیانکردە قالب و لەسەریەکیان دادەنا، لەولاتر هەرچی کۆنە فافۆنی دونیاهەبوو

لەسەریەک کەتبوو، کەرتەجێب و کەونە مەکینەو پلێت و هەرچی فافۆنی پیوەبێ، بۆتواندنەوە داندرابوون، لەنیوەو ناوبڕەکەی تریش کارگەیەک بوو، کەهەموو قالبێکی پێوەبوو، مەنجەڕو سێنی و تەشت و قاپ و مراک و کەوگیرو کەرەستەی تری پێ درووست دەکرا، لەقولینچێکی دژوونیش لەولاتر چەند جێگەیەک لەنزیکی یەک راخرابوون، پیاوە سەرسپیەکە شکۆی ناردە ئەوێ و بەخۆشی گەڕایەوە سەر ئیشەکەی، ئەوان شەش کەس بوون و هەرکەسەو بەئیشی خۆی سەرقاڵ بوو، لەبەر گڕەی پریمزو تەقەتەقی کەلوپەل بواری قسەو پرسیارو هەواڵ نەبوو،

دونیا رووناک بوو و ئەوانیش کورەکانیان کوژاندەوە و یەک یەک دەست و چاویان دەشووشت و دەهاتنەوە سەر جێگاکەیان، یەکیان خەریکی تەباخێکی شینی چلکن بوو، بۆ چایەو هێلکە، یەکێک رۆیشت بۆ هێنانی سەموونی گەرم و زوو گەڕایەوە، بەماندوو بوونیانەوە دیاربوو ئەوان لەئێوارەوە دەستیان بەوئیشە کردبێ !، بەدەم نان خواردنەوە پرسیار رووی لەشکۆ کردو ئەویش یەک یەک وەڵامی دەدانەوە، شکۆش پرسیارێکی بۆ رەخساو پیشنیاری کرد لەگەڵیان ئیش بکات ؟، دیاربوو هیچ کامیان خاوەنی کارگەکە نەبوون، پیاوەسەرسپیەکەش گووتی: دەمەشکە کاک شەهاب دێتن و ئەمن لەبۆت پیی دەرێم، بەرام دەبی کوڕەکی چاک و دەستت خاوین بی، ئەوەندەی تەمەشاشت دەکەم خراپەت لێ ناخینمەوە..

هەندەی نەبرد دەنگی غەڵبەغەڵبی گەلابەیەک نزیک بوویەوەو قونی بەدەرگای کارگەکەوە نا، گوتیان ئەوە شەهابیش هات، دەرگاکەیان بەتەواوی کردەوەو شەهاب بەژۆرێ کەوت، پیاوێکی سەر رووتی قوتەخڕەی تێک چەقی، لەبەر ورگ و تەنگەی، کراس لەبن قایشی گیرنەدەبوو، ئەو هەر لەگەڵ سڵاوەکەی زەینی لەسەر مەنجەڵ و تەشت و بەرهەمی ئەم شەوەی کارگەکەی بوو، هەندێکیش پەلەی پێوەدیاربوو، هەرلەسەر پییان پێشنیاری شکۆیان بۆ کرد کەلەگەلیان ئیش بکات، ئەویش

کەمێک بەوردی تەمەشایەکی شکۆی کردو گوتی: ئەوە هێشتا گچکەیەو منداڵە ! ئیشی تەواو پێ ناکرێ، ئەگەر بەنیوەی رۆژانەی ئێوە رازیە لەبەرخاتری ئێوە باڵەگەڵتان ئیش بکا، شکۆ خۆشحاڵی پێوەدیاربوو، چونکە سەرەڕای شوێن، ئیش و رۆژانەشی دەست کەوت، ئیدی هەمووان بەخۆکەوتن بۆ گواستنەوەو بارکردنی کالاکان، هاتنی شەهاب بۆ کارگە تەنها بۆچەند شتێک بوو، هێنانی فافۆن وبردنەوەی بەرهەمەکان، پێدانی کرێی هەفتانەیان،

مەگەر جاروبار ئەگەر ئامێرو کارگەکەی کێشەیەکی هەبوایە، دەنا ئەو بەردەوام خەریکی گواستنەوەو فرۆشتنی بەرهەمەکانی بوو بۆ شارو شارۆچکەکانی تر، ئیشی ئەو کارگەیە پاش عەسران دەستی پێدەکردو تا تاریک و روونی بەیانیان بەردەوام دەبوو، بەیانیانیش تاعەسر ئیسرەحەت و خەوتنیان بوو، چوار لەکرێکارەکان خاوەن ماڵ و خێزانداربوون و بەیانیان دوای کوژانەوەی کارگە دەچوونەوە ماڵیان و عەسران دەهاتنەوە، ئەوەی دەمایەوەش پیاوە پرچ سپیەکە مام (برهان) بوو، لەگەڵ کوڕە گەنجێکی باریکەی ریتەی رەشتارەی پرچ گروازەی چاورەشی چاوگەش بوو، تازە لەهەرەتی لاویدابوو، ناوی سەرتیپ بوو پێیان دەگۆت (تیپە ) ، شکۆش بووە هاوڕێ و هاودەمیان، هێدی هێدی ئاشنایەتی لەنێوانیان پەیدا دەبوو و کەم کەمە لەکاتی ئیش و جارجارەکەش لەکاتی پشوو بەپرسیارەکانیان گرێی چارەنووس و حەسرەت باری شکۆ دەکرایەوە، دوای ماوەیەک دڵنیابوون کە خەم وبەسەرهاتەکانی شکۆ خەیاڵ و چیرۆک نیە، زامێکی ئەوەندە قوڵە، بەرگە گرتنی ئاسان نیە، بۆیە هەمووان خۆشیان دەویست، شکۆش سەبووری پێیان دەهات.

مام برهان پیاوێکی پڕ مەشەققەتی رۆژگاربوو، ژیانی کۆمەڵێک وێستگەی وێران و خەرابات بوو، ئەویش پڕ بوو لەو باڵندانەی کەبەردەوام سەفەریان پێ دەکردو دەیانبردەوە بەر پەنجەرەی فریشتە مردووەکانی،

تاریکی دوێنییان وەک ژەهر بەلێویەوە دەکرد، ئەو کارگەیە بۆ مام بڕهانیش جگە لەشوێنی نان و کار، بگرە ماڵ و خەو و هەموو ساتەکانی ژیانی بوو، ئەو کارگەیە شوێنی خۆشاردنەوە بوو لەژیان، لەهەناسە ساردی پایز، لەگەلای بەناهەق وەریو، لەچاوی ئومێدی خێرلەخۆ نەدیو، شکۆ لەگەڵ مام بڕهان و تیپەدا هەندێک لەئازارەکانی کەم ببوونەوە، نەکەس سەردانی دەکردن و بەسەریانەوە دەهاتن، نەچاوەنواڕی کەسیش بوون، مەگەر جارجار شەوانە درەنگ تیپە بزردەبوو و مام بڕهان دەیگووت: شکۆ با دەست وبرد بکەین، کەلێن نەکەویتە جێی تیپەی، شەهاب بزانی رۆژانەکەی دەبڕیتن، تیپەش ئەو فعلە قوڕەی تەرک ناکا، مەگەر خوا بزنی ئەلعان لەکێیە !،.

ماوەیەک بەسەرچوون، شکۆش وەک ئەوان سەروسیمایی، گڕودوکەڵی کورەی گرتبوو، دەست و پەنجەی لەئاگرو فافۆن راهاتبوو، گەلەک زیاتریش ببوونە هاوڕێ و هاودەمی یەکتر، شەوێکی درەنگ دووای تەواو بوونی کارەکانیان و کوژاندنەوەی کورەو کارگەکە، لەتەنیشت یەک لەسەر جێگاکانیان راکشان و تەقەیان لەدەرگایی بیرەوەریەکانی تیپە هێنا، تیپەش دەستی کرد بەگێڕانەوەیان و گووتی: ئەمە لەبنەچەوە هی دیبەگەین و قەت لەکەندێناوەی دوورنەکەتینەوە، لەبیرمە تازە خۆم ناسیبوو، دوازدە سار دەبووم، گەلەکم حەز لەپاسکلی بوو، کوڕە گچکەی مارێش بووم، داکم زۆرعەولی لەگەر بابم دا، هاوینێ بابم پاسکلەکی بیستی لۆ کڕیم، لەخۆشیان داکاسانم نەبوو، هەرچی جادە و کون و قوژبن و کۆران هەبوو پێدادەچووم، پاسکلەکەم جەڕەسەکی پێوەبوو، هەرلەخۆمەوە لێم دەدا، جڕڕڕڕڕن جڕڕڕڕن، گەلەک کەیفم پێدەهات، پاش عەسران هەتا پیلم دێشا پێی دەسوڕامەوە، باشی لێ راهاتبووم، عەسرەکێ بەکۆرانەکی بەریندا تێدەپەڕیم، کیژەکی چاو گەشی بژانگ درێژی رەنگ گەنمی پرچ درێژی خاو، بەژن و بارایەکی باریک و جوان، حەفت هەشت ساریش لەمن گەورەتر

دەبوو، لەبەر دەرکەی خۆیان راوەستابوو، ئەمنیش یەکەم جار بوو کیژەک ببینم و کەیفم پێی بێ و لەخۆشی پاسکلەکەشم جەرەسەکم لۆی لێداو بەسووکە پێکەنینەکیش تەمەشام کرد، ئەویش بەڕووەکی گەشاوەو خۆشەوە تەمەشای کردمەوە ددانەکانی بریسکەیان هات، هەتا ئەوسەری کۆرانی چووم، دیتم هەرتەمەشام دەکا، درم ئەوەندە پێی خۆش بوو، گەڕامەوەو دیسان جرڕڕڕن، زۆر کەیفم بەخۆم هات، ئەویش پیکەنی و بەدەست و پەنجەکانی سەلامەکی لۆ کردم، ئیدی لەخۆشیان هەروەخت بوو بەسەر دارو دیواران کەوم، دەمویست لەپێش چاوی بفڕم، خۆ ئەو گەلەک لەمن گەورەتر بوو و ئەمن تازە بالغ دەبووم، بەرام هەستەکی وەهام کرد هەناوم لۆی دەهەژا، بەومنداریەیی راست عەشقی بووم، ئەوجارە چوومەوە سەری کۆرانێ و بەخێرایی پێم گۆت: سبەی دێمەوە.

پێم لێناو هەراتم، ئەوشەوی هەتا نووستم لەفکرم نەدەچوو، لۆ سبەی ئەو وەختی دیسان چوومەوە، چاوم گێڕا دیارنەبوو، جرڕڕڕن جرڕڕڕڕن، هیچ نەبوو، هەتا ئەوسەری چووم، دیتم کەونە دەرکە کراوە، لەپێش چاوم دنیا رۆناک بۆوە، وەخت بوو بمرم لەخۆشیان، نەرمە پێکەنینەکەی کردەوەو ناو روومەتی لەگەر قۆر بوون، قیچەک رۆیشتم و گەڕامەوە لەنێزیکی رامگرت، خۆ هیچ قسەکیشم نەدەزانی پێی بریم، بشمزانیبایە نەدەوێرام، بەرام گەلەکم خۆش ویست، دیسان هاژووشتنەکی شێتانەم لەپێشی کردەوە، دیسان بەپەنجەکانی سەلامەکی لێ کردمەوە، ئەوجارە بەڕاستی لۆی شێت بووم، گەیشتمە سەری کۆرانەکەی و دیسان گۆتم: سبەی ئەو وەختەش دێمەوە، ئەو چۆوە ژۆرێ و ئەمنیش رۆیشتم، ئەوکیژەم لەبیرنەدەچوو، هەردەم لەپێش چاوم بوو، خۆ نەمدەزانی قسەکی دریشم بکەم، بەرام درکم بەخەونەکی دەکرد ! لەدرێ خۆم دەمگۆت سارەشکە گەورە دەبم وهەموو قسەکی درێ خۆمی پێ دەرێم، گەورە دەبم و دەبیتە هی من و هەردەم پێکەوە دەبین، وازم لەو کۆرانەی نەدەینا، هەردەم حەزم

لێ بوو ببینم، گەلەک درم خۆش دەبوو وەکی جەڕەسم لێدەداو دەهاتە دەرێ، ئەویش وەکی منی لێ هاتبوو و ئەمنی خۆشدەویست، دەمەو نێوڕانەکێ لەبازاڕی بووم، مام برایمی جیرانمانم کەتەپێش چاوی، زەمبیلەک و سێ چار زەرفە عەلاگەی پێ بوو، گۆتی راوەستە تیپە ئەو زەمبیلەم لۆ ببەوە لەپاسکلی قەیمکە.

ئەمنیش خەنی بووم، خۆم پێ گەورەبوو لەخوام دەویست هەست بکەم گەورەم، زەمبیلەکەم لەپشتەوەی پاسکلەکەم قەیم کردو لۆم گەیاندەوە مارێ، ژنەکەی زەمبیلەکەی لێ وەرگرتم و سێوەکی سۆری لێ دەریناو دایمێ، گەلەکم شەرم کرد بەرام لۆیە وەرمگرت هەتا بیدەمە کیژەکەی خۆشم دەویست، چوومەوە مارێ سێوەکەم لەناو کەنتۆری شاردەوە، کەنتۆرەکەمان سەرەوەی جامخانەکی گچکەبوو، هەندەک پیارەو بن پیارەو بەرداغی تێدابوو، لەخوارێش چاردەرکەی هەبوو هەموویان کلیل دانیان شکابوو، پڕی جلک وبەرگی جستانێ بوو، پاش عەسرێ سێوەکەم لەبەرکم ناو سواری پاسکلەکەم بوومەوە و چوومەوە پیش ماریان، جرڕڕڕن جرڕڕڕن، تا ئەولاترچۆم، گێم لەسیکەی دەنگی دەرکە کردنەوەی بوو، بەخێرایی گەڕامەوەو دیتم هات، دەستم کردە گیرفانم و سێوەکەم لۆی راگرت و گۆتم: لۆتووم هینایە.

+ ئۆۆۆ سێوت لۆ هینایمە ؟ ئەتوو ناوت چیە ؟

_ ناوم سەرتیپە، پێشم دەرێن تیپۆ، ئەدی ئەتوو ناوت چیە ؟

+ ناوم مەهاباتە.

دەمەک تەمەشای ناوچاوی یەکتریمان کرد، یەکەم جاربوو هەست بەخۆشەویستی بکەم، پەیدانم لێداو برەک ئەولاتر چووم و هاتمەوە

گۆتی: ئاگات لەخۆت بی، ئەتوو ئەوها خێرا ماژۆ ما !.

گۆتم: خەمت نەبی و خێراتر پەیدانم لێدا، دیسان لەسەری کۆرانەکەی گۆتم سبەی ئەو وەختانە دێمەوە.

لۆسبەینێ رۆژانەکەم وەرگرت و چوومە دووکانێ مارێ ئەحمەد خاسێ ی سێوەکم کڕی و وەکی جاران عەسرەکەی چوومەوە پێش ماری کیژەکەی، جڕڕڕن، ئەوجارە وەکی برێی زووتر دەرکەی کردەوە، لەنێزیکی رامرگرت، پەنجەی لەسەر جەڕەسی پاسکەلەکەم داناو جڕڕڕن، لێیدەدا، سێوەکەم دەریناو دامێ.

+ دیسان سێوت هینا ؟ لۆ هینات ؟، پێم برێ مارتان لەکییە ؟

_ مارمان لەکن مەکتەبە بەردەکەیە، ئەوەی حەوشە گەورەکەی هەیە.

+ باشە گیانە ئاگات لەخۆت بی، سەریع ماژۆ باش.

وەکی گۆتی (گیان) وەخت بوولەخۆشیان بمرم !، بەتەنناش پەیدانم لێداو هەندەک ترسم شکاو ئەوجارە ئەمنیش بەدەست خواحافیزبوونم لێ کرد.

عەسرهاتن وچوون، ئەوەندەم سێو لۆ ئەوکیژەی دەبرد، ئەحەمەد خاسێ ی سێۆ فرۆشیش ببووە برادەرم، بەرام بەمەسەلەی کیژەکەی نەدەزانی.

عەسر لەکنەمن وەکی چوون لۆ بەهەشتێ بوو !، وەکی مەلا بانگی دەدا، ئۆقرەم نەدەما، ئەگەر رۆژەک پێم نەکرابایە بچم، رۆناکایی لەدرم نەدەما، عەسرەک پاش سەلام وسێو و جەڕەس لێدان، زیاتر لێم نێزیک بۆوەو دەستی لەسەرملم داناو دەستەکەی دی لەناو گروازەی پرچم وەردا، دووسێ جارانیش نیوچەوان و روومەتی ماچ کردم، بەران وەکی چەندجارە نەبوو، زۆرکزوعێدز دەهاتە پێش چاو!، جاران چاوی دەتگۆ ئەستێرەنە !، وەکی جارانیش هەناوی پڕ قسەنەبوو !، بەس گۆتی: ئاگات لەخۆت بی تیپۆ، حەزم لێیە گەورەبی و وەکی ناوەکەی خۆت ببیە سەرتیپ.

ئەوەندە هەستم بەعێدزیەکەی کردو قسەکانی وەهای لێ کردم گریانم هات، بەران بەسەرەخۆم نەینا، حەزم دەکرد هەر ئەوکات گەورەبم و دەستی بگرم وپێکەوە برۆین، لەبیرمە ئەو رۆژی چوومەوە بەدزی

وبەخێرایی دەموچاوم بەسابوون کردو بەتاخمە تراشی بابم مووسم پیداهینا، گەلەک بەپەلەی هاتنی سمێرۆ ردێنم بووم، لەدریَ خۆم دەمگۆت ماوەشکە پێویستمان بەعەسران و جەڕەسی پاسکل و دەرکە کردنەوەی نامینیَ، هەتاهەتایێ پێکەوە دەبین و قەتیش لێک جیانابینەوە، شەویَ هەتا نووستم هەرلەو فکرانەدابووم و چاوەڕیَ بووم سبەینیَ هەستمەوە سمێرو ردێنم هاتبیتن !، لۆسبیانیَ کەهەستام یەکەمجار چوومە بەر نەینۆکیَ ! وەها چاوم چڕ کردبۆوە، لەدوو کەرە مووەکیش دەگەڕام، عەسرەکەی وەکی چەندجارە رۆژانەکەم وەرگرت و سێوەکەم لەئەحمەد خاسێی کڕیَ، چوومەوە کۆڕانیَ و جڕڕڕن جڕڕن، دیارنەبوو!، درم خورپەی کرد، چونکە بەو دواییەی هەندەک جار بەبیَ جەڕەس وەکی عەسر بانگی دەدا دەهاتە دەریَ، هەتا ئەوسەری بەجەڕەس لیدان چووم و هاتمەوە هیچ دیار نەبوو!، قیچەشکە خۆم تاخیرکردو ئەوسەرو ئەوسەرم کرد، نەبوو!، درم زۆر ناخۆش بوو، چوومە کۆرانەکەی دی و بەولاتردا هاتمەوە، لەکن دەرکەیان جڕڕڕن، هیچ نەبوو!، زۆرم خۆتاخیرکرد هەرنەبوو، لەبیرمە برسیشم بوو حەزم چووبووە سێوەکەی بەرکم، بەرام چونکە لۆویم هینابوو نەمخوارد، ئەو رۆژی هەتا درەنگ بەوێدا سوڕامەوە بیَ فایدەبوو، لۆسبەینیَ دیسان رۆژانەکەم وەرگرت و سێوەکەی دونێم خواردو ئەوەی تازەکەشم لەبەرکم ناو وەکی جاران چووم، دیسان دەرکەکە داخرابوو و بەجەڕەسانیش نەبۆوە!، پێنج شەش رۆژان هەموو عەسران دەچووم و بەبیَ هومێدی دەهاتمەوە، عەسرەکی چووم سێوەکەم کڕی و لەسەری کۆرانی قەرەبارغی هەبوو! لەوسەرو ئەوسەری کۆرانی سەیارە وەکی قیتاڕی پێک وەنووسابوون !، دەرکەیان کرابۆوەو قەرەبارغیەکە لەویَ بوو، جڕڕڕن، لەبەر دەنگەدەنگ و غەربەغەرب جەڕەس بڕی نەدەکرد!، چوومە بەرابەر دەرکەیان دیتم حەوشە گەورەکەیان پڕ ژن و زەلام بوون بەجلکی کوردی، پاسکلەکەم هەرپەساردو سێوەکەم لەبەرکم دەرێناو چوومە حەوشەیان،

لەبەینی ئەو و ئەو زیاترچوومەپێش، دیتم مەهابات بەجلکی بوکێنی لەسەر کورسی دانیشتیەو ئەو حەشاماتەش لەدەوری ئەون، تەمەشایەکی منی کردولەسێوەکەی دەستم راما، فرمێسکی هاتنە خوارێ. تیپە بەگێڕانەوەی بیرەوەریەکانی، پەنجەی کۆچی لەخوێناوی یاد وەردەدا، لەناخەوە گوڵە مردووەکانی دەچوونەوە سەر لقەکانیان ودیسان دەوەرینەوە، هەموو باڵندە کوژراوەکان بەجەستەی سووری خوێنینەوە دەهاتنەوە بەرپەنجەرەکانیان، هەمان خەنجەرەکەی جاران برینەکانی شەق دەکردنەوە، گڕی یادی کەندێناوەو هەواری کۆن، هەمووشەوێ لەناخی تیپە دەبوونەوە بەخۆڵەمێش، ئەوشەوەش خەیاڵنامەیەک هاتنە گۆو ولەناخەوە لێیان پرسی؟ دەبێ مەهابات ئەو رۆژانەی لەبیرمابێ؟، کە جەرەسێک دەبیستێ، کەپایسکلێک دەبینێ، کەعەسرێک بانگ رادەگێڕێ، کەهەناوی سێوێک شەق دەکا، کە بەهێمنی شیشی هەر دەرگایەک دەکاتەوە، چی بێتە یاد ؟ ئاخۆ ئێستا هەوری خەمی بارانی کامە پێدەشتی کەندێناوەی پێ تەڕدەکات ؟ ئاخۆئێستا چاڵەکانی نێو روومەتی، تریفەی نێو سۆماکانی، وەرزە بەهاریان پێوە ماوە ؟ بێتە یادی منداڵێک ناوی تیپەبوو، لەگەڵ هەموو عەسرانەیەک لەپێش دەرکەیان وەستاوە ؟. . . .

شکۆ بەپرسیارێک لەوخەیاڵە رایچڵەکاندو پێی گووت: لەمێژە لەهەولێرێی ؟.

تیپە: شەش سار دەبی.

شکۆ: ئەدی کەس وکارت ؟ جارجار ناچیەوە ؟

تیپە: باوڕناکەم جارەشکە بگەڕێمەوە.

شکۆ: لۆ ؟ گەلەکم پێ خۆشە بزانم.

تیپە گەڕایەوە نێو بیرەوەریەکانی و بەهێمنی خزایە نێو ئەو ئازارانەی کەلەسیمایدا بەئاشکرا دیاربوون و دەستی کرد بەگێڕانەوەیان.

بابم پیاوەکی تورەو رەقکارەبوو، ئەمەی خۆش دەویست بەران قەت نەیدەهێشت درک پێ بکەین، چونکە بەخۆی خیندەواری نەبوو و حەزی لێ نەبوو ئەمەش بخینین، جارێ خوشکەکم هەبوو هەرلێی گەرێ ! ئەو هەرکفربوو بخینی !، ئەمنیش شەش ساران خیندم، بابم گۆتی هیچکە مەچوو، سی چل سەرمەرو بزنی کری و ئەمنی ناردەبەرێ، بەخۆشی پارچە عەردەکمان هەبوو هەر خەریکی تۆکردن و زەراعەت بوو، تەرەکتەرەکیشمان هەبوو هەردەم دەستی تێدابوو، وەکی لێی عاسێ دەبوو وەک گای رەشی لێدەهات، دەهاتەوە هەرچی ورتەی لێوەبهاتایە دەستی لێ دەکردە حەیزەرانی، داکم ژنەکی گەلەک باش بوو، دەیگۆت گێ مەدەنە بابتان، گەلەکیش خۆراگربوو بەرامبەر بابم، ئەمنیش دەشتێ و بەر بزنانم پێ ناخۆش نەبوو، گەلەکم حەز لەبەخێو کردنی مارات و پەرەوری هەبوو، هەر لەتەنیشت مارێشمان حەوش و حەسارەکی گەورەمان هەبوو، سەری هاروماری تێدابوو، کۆریت و کەچە بەرمیل وپێبرقەو هۆرەکی درێژ سەری بەپلێتان گیرابوو، ئەمنیش دوو کۆترم کری و لەحەسارەکەی جێم لۆ درووست کردن.

تیپە باسی کۆترەکانی بۆ مام برهان و شکۆ دەکرد، ئەو دوو کۆترەی لەوێ باڵیان گرت و ئەوێیان کرد بەنیشتمان، یەکەم بەیانی عیشقیان لەبەر خۆرەتاوی زستانێک و بەماچی دەنووک و مژینی گەردەن دەست پێ دەکرد، لەسەر هەردارێک پرچی درێژی هەردرەختێک هەربستە عەردێ، عیشق و بەڵێن و پەیمانیان دەگۆرێەوە، بەیەکەوە لەشەققەی باڵیان دەدا، بەیەکەوە دەفرین، بەیەکەوەش دەنیشتنەوە، سەرەتایی گروگاڵی عیشقیان سەرەتای ماڵ و نیشتمانیش بوو، هێشتا منال بوون، تازە لەزمانی یەکتر دەگەیشتن، ئێواران بەبروا بەخۆبوونەوە پاڵیان بەیەکتری دەداو تابەیانی سەبووری بوون بۆ یەکتر، دووای بەڵێن و بۆیەک بوون مشووری هێلانەیەکیان خوارد تاببێتە نیشتمان بەدووای چیلکەو پووش و پەلاشدا

دەگەڕان، بەدەنووکە ساواکەیان هێلانەیەکیان درووست کرد بچووک بەقەد قەناعەتی خۆیان، ئەوان ژیانیان جوانتر کردبوو، شیرین خانی کۆتر دووهێلکەی سپیی کرد، سپی وەک رۆحی خۆیان، وەک ئەو پەلە هەورانەی لەئاسمان گرمۆڵە دەبن، ئەوەندە خۆشی دەویستن دەیخستنە نێو هەناوی، بۆ چرکەیەکیش بەجێیان نەدەهێشت، بەیانیان کۆتری تازە زاواو تازە باوک شیرین خانی خێزانی بەجێ دەهێشت بۆ پەیدا کردنی نان، بەڵام دوورنەدەکەوتەوەو چاو و زەینیشی هەرلەلای دولبەرو هێلانەو هێلکەکانیان بوو، بەرلەنیوەڕۆ لەشەققەی باڵی دەداو دەگەڕایەوە و بەزمانە شیرینەکەیان چەند ووشەیەکیان دەگۆڕیەوەو رێکدەکەوتن ئەمجارە شیرین خانی نازەنین هێلکەکانی بەعاشقەکەی رادەسپاردو بۆ نان و ئاو خواردنەوە دوچووە خوارەوە، کۆتری تازە باوک لەسەر هێلکەکان کڕدەکەوت، شیرین خانی پەریزادەش لەکاتی هەڵگرتنەوەی هەردەنکە گەنمێک چاوی هەڵئەبڕیەوە هێلانەو نیشتمانەکەی، هەستی بەهەر چرپەیەک و نائارامیەک بکردبایە، لەشەققەی باڵی دەداو دەگەڕایەوە لای دەستگیرانەکەی، لای پیاوەکەی کەبەهەموو کۆترەکانی دونیای نەدەگۆڕیەوە، ئەوان کەعاشق دەبن لەپیرۆزی عیشق دەگەن، دووای بیست رۆژهێلکەکان درزۆکەی بچووکیان برد، ئەوان وەک بڵێی میوانێکی ئازیزیان هاتبێ، بەدیاریەوە وەستابوون، چەند پەرۆش بوون بۆ ئەو دیدارە تازەیە، شیرین خانی چاوڕەش هێدی هێدی بەدەنووکە جوانەکەی درزی هێلکەکانی گەورەتر دەکرد، توانای چاوەڕوانی نەدەما، هێندە پەرۆشی دایکایەتی بوو، ئیدی لەنێو هێلکەکان دوو ساقەسوورەی رووت وقووت هاتنە دەرێ، شیرین خانی بەوەفا خێراخێرا قومی پڕ ئاوی بۆدەهێنان، تا توێنیتیان بشکێنێ، ئیدی پرۆسەی بەخێوکرن و چاوەدێریشیان دابەش کردبوو، بەردەوام یەکیان بەدیار جمکەکەیان بوون و لەترسی سەرما لەبن باڵیان دەیپاراستن، ئەوەی تریش کەدەنکە گەنمی دەست دەکەوت لەشەققەی باڵی دەداو دەگەڕایەوە لەدەمی

جمکە ساواکانی دەکرد، پەیدا کردنی نانی بەیانان لەسەر شیرین خان بوو و باوک بەدیار کوڕو کچەکەیەوە، ئێوارانیش باوک دەچوو بۆ پەیدا کردنی نان و شـیرین خـان بـەدیار جمکەکەیـەوە دەبـوو، لەگـەڵ ئـەوەش عیشـقیان فەرامۆش نەدەکردو شەوان هەمیشـە بەدیارجمکەکەیان پاڵیان بەیەکتردەدا، دووای چەنـد هەفتەیـەک جمکەکـەیان گـەورەبوون و پـەڕۆباڵیان دەریکـرد، بەیانیەک پرۆسەی فڕین دەستی پی کرد، باوک لەخوارەوە بانگی دەکردن و شیرین خانیش لەهێلانەوە هانی فڕینی دەدان بۆ خوارەوە، باوک بەگۆرانی ودەنگی پڕتامـەزرۆی خۆی مـوژدەی فـرین وئـازادیی ئاسـمانی دەگووتـەوە، ئەوناوە پڕدەبوون لەسروودی بەیانی، شیرین خانیش بەگۆرانی (تـاتی تـاتی بۆسەرچاوی چەپ و راستم بەخێراتی) بۆ دەگووتنـەوە، جمکـەکانیش هێشـتا بەدڵە راوکێوە سووکەسووکیان دەکرد، هێشـتا لـەفڕین نەگەیشتبوون، ئیدی بۆیەکـەم جـار خۆیـان هەڵدایـە ئاسـمان و لـەلای باوکیـان نیشـتنەوە، شـیرین خـانیش بەدوایانـدا نیشـتەوەو پیرۆزبـایی سـەرکەوتنی لـێ دەکـردن، ئـەوجا پرۆسەی هەڵگرتنەوەی گەنم دەستی پێکرد، دەنگە گەنمیان دەخسـتە بـەرپێ و دەنووکی منداڵەکانیان، تا فێری پەیدا کردنـی نـانیش بن، دوای نیوەڕۆش پرۆسەی هەڵفڕین و گەڕانەوە بۆ نیشـتمان و هێلانـە دەسـتی پێ دەکردەوە، شـیرین خـان چەنـدجارێک لەبـەرچاویان لەشـەققەی بـاڵی دەداو دەگەڕایـەوە، لـــەوێش بـــانگی دەکـــردن وەرنـــەوە بـــۆ نیشـــتمانی دایـــک، ئـــەوانیش بەسووکەسووک، گلەیی ئەو ئەرکە قورسەیان بوو، ئەو پرۆسـەیەش زۆری نەدەبرد، ئیدی ئەوانیش فێری فڕین و نان و ژیان دەبوون، بەیانیەک خۆیـان دەدایـە بـەرخۆری زسـتان و ئـەوانیش عیشـق و وەفـاو پـەیمانی ئەبـەدیان دەگۆڕیـەوە، بـەدەنووکی سـاواو و فەریکـە لێویـان مـاچ و مژینـی گـەردەنی یەکیان دەکرد، مشووری هێلانەو نیشتمانیان دەخوارد، ئەوانیش سـەرلەنوێ تێهەڵدەچوونەوە.

تیپە بەردەوام بوو لەگێڕانەوەی ژیان و نەهامەتیەکانی ئەوسای شکۆ و مام بڕهانیش بەپەرۆشەوە گوییان بۆشل کردبوو،

تێپە: هەموو رۆژێ سبیانان زوو دەچوومە بەر بزنان، زۆربەی رۆژیش یەکەک لەکۆترەکانم لەگەر خۆم دەبردو لەبناری قەرەچوغ بەڕەڵام دەکرد، ئێوارایش کەدەگەڕامەوە جارێ زوو دەچوومەوە دیاریان ئەوەندە درم خۆش دەبوو کەکۆترەکانم شارەزان و دێنەوە شەوان کە لەبەرامبەریان دادەنیشتم عیلەت و ماندیبونم تێدا نەدەما هەتا وەختی خەوێ داکم دەهات و دەیگۆت کوڕم دەوەرەوە هەوکە رۆژهەردێ، واچاوت کوێرە دەبی لەخەوان، ئەوجە دەچوومەوە سەرجێ،

رۆژەک لە ئاقارێ جانەو تیکالۆی لەبەربزنان بووم، هەندەک ئاسن و سەرکە قەلابەو عارەبانەی تەنەکتەری دیاربوو لەمێژبوو لەوێ فڕێدرابوو!، باران ژەنگاوی کردبوون، ئەمنیش هەرلۆخۆم لێی نێزیک بوومەوە، دیتم لەبن کەچە بۆدیەکەی گوجیلەکی خڕیلەی سپی سەرکەپوو رەش لێی مرڕاندم!، زۆر کەیفم پێی هات بەو گچکەییەیی خۆی لێم نەترساو مرڕاندی، ئەمنیش پەلکە نانەکم لەبەرکی دەریناو لۆم فڕێدا، دیاربوو برسی بوو، نانەکەی هیناپێشەخۆیی و خواردی، وازیشی لەمرەمرەکەی هیناو کلکەقووتەی لۆ کردم، رۆژی پاشترێ چوومەوە دیاربوو ناسیمیەوە!، دیسان پەلکەنانەکم دایێ، ئەوجارە تەواو ترسی لێم شکا، ئیدی هەموو رۆژێ کەدەچووم لەدوورەوە بەپیرم وەدەهات!، گەلەک لەگەرم دەماوەو ببووینە برادەر، ماوەکی پێچوو هەراشتر ببوو، ئەمنیش هەموو رۆژێ خواردنم لۆدەینا، هەموو رۆژێ هەتا رۆژئاوا لەگەرم دەماوە، پێ دەچوو داک و شتی نەمابوو، هێوارەکێ وەختی گەڕانەوەی ئەویش لەگەرم هات وئەوجارە نەگەڕاوە، لەگەر بزنان هینامەوە حەسارێ، بابم چاوی پێکەت لەقەلبی ناخۆش بوو، گۆتی سەمان لۆچیە؟، لەپەرگەی حەسارێ کۆریتەکم لۆی کرد، بەیانیان پێشی من حازردەبوو!، دەچووینە بەر بزنان هەتا

هێواریٚ لەگەرم بوو، دانیشتبام ئەویش دادەنیشت ! گەلەکی حەزلەگەمان بوو، چونکە لەبن بۆدی قەلابەکەی بووینە برادەر ناوم لێنا (بۆدی ) ، پایزەکی پیٚ چوو تەواو گەورەبوو، ئازاو چاونەترس، هەتابریٚی بەئەمەک بوو، زۆرجار بەقەستی تاکە پێراوەکم بەجی دەهێشت، هەریدەگرتەوەو وەک بای دەیهیناوە لەپێشم دایدەنا!، چما ئەگەر شوانەک لەو کەندێناوەی بەگەمەش زۆرانەمان بکردبایە، (بۆدی) خۆی لیٚ شێت دەکرد و نەڕەنەڕی چۆکی پیاوی دەهەژاند، شوانەک نەبوو بوێری توخنم بکەوی، هەندەک جار بەقەستی بەکن سەرکە قەلابەو ئاسن و بۆدی تەنەکتەرەکەی دادەچوومەوە بزانم چ دەکاو بەبیری دێتەوە؟ دەمدیت دەچوو سەرەکی بەجێیەکەی خۆیدا دەگرت و هەندەک دادەما!، وەکی ئەمن دووردەکەتمەوە بەغار دەهاتەوە، سار سوڕایەوە تەواو گەورەببوو، لەبۆمن لەتفەنگەکی باشتربوو، شام بەسەپان نەدەزانی، شەوان حەرەسی بزنان بوو، بەیانیانیش بزنەکانی بەپێشەخۆی دەداو ملی ئاقاری دەگرت، هێوارەکیٚ گەڕامەوە ماراتم لەحەساریٚ کردەوە، چوومەوە گێم لێبوو بابم قسەی لۆداکم دەکرد، دیاربوو خەریکی تەعین بوون بوو لەهۆبەی زراعەی دیبەگەی، عەرزوعارەکەی لەدەستی بوو و دەیگۆت: پسام بەهیلاک چووم بەو سەگبابیەی، ئەو تەنەکتەرە سندان کوشتیە حەیاتی لیٚ بڕیم، ئەوەندەی عومرم مایە باهەندۆکەک ئیسرەحەت بکەم، ئەو بزنە خۆڕیانەش هەر ئیستیفادەیان نەبوو، دەبی تاقیان لیٚ ببڕم و حەسارەکەی بکەمە عەمباریٚ جۆی، زۆر زیاتر قازانجمە، ئەو قیچە مەعاشۆکەو ئەگەر هات بیٚ ئەو فەلاحۆکەتیەم بەسە.

تەزییەک بەهەناوم داهات، لەدریٚ خۆم گۆتم ئەدی سەیەکەم؟، ئەخر خۆئەوەندەی لەگەر ئەو سەیەیی بووم لەگەر کەس نەبووم!، بەس ئەوەندەبوو زمانی نەبوو!، ئەگەرنا رۆژیٚ دوو جەمان پێکەوە نانمان دەخوارد.

هەندەی نەبرد بابم بەسایەق تەعین بوو، قەسابەکی هیناو بزنەکانی بەگۆترە فرۆشتنی، زنجیریشی لەملی سەیەکەم کردەوەو بەڕەلای دەرێی کرد، دەستم بەگریانی کردو وەکی بابم رۆیی سەیەکەم هیناوە حەساری و بەداکم گۆت سەیەکەم هینایتەوەو بەبابم برێ ئەمن و ئەوسەیە مردن و مانمان پێکەوەیە، ئەگەر بڕوا ئەمن نابیننەوە، نەشدەوێرام بەخۆم لەگەربابم قسەی بکەم چونکە گەلەک بێ تەبیعات بوو دەمزانی دەبیتە شەڕمان، هێواری وەکی هاتەوە سەیەکەی دیت لەحەساری کافربوو، سەیەکەی لەقوژبنەکی کردو دایە بەرداران، هاواری من و سەیەکەی دەگەیشتە کەشکەلانی فەلەک، سەیەکەم هەموو سەرومێشکی خین بوو، بەهەزارحار قوتاربوو لەبەدەستی بابم و رۆیشت، ئەمنیش ئەوشەوی نانم نەخوار، هەتاسبەینێ لۆی گریام، لۆسبەی هێوارەکەی دیتم سەیەکەم هاتیتەوە، هەردووچاوی پڕخین ببوو، نان و ئاوم لۆدانا، بەرام گەلەک عێدزبوو، لەزمانیم نەدەزانی هەتا هەرچی لەدرمە پێی برێم، نەمدەزانی کۆ پێی برێم ئەمن شەرمەزارتم، نان و ئاوم لۆبەجێ هێشت، بابم وەکی زانی سەیەکەم دیسان هاتیتەوە، زۆر تورەتر بوو بەرام هیچی نەگۆت، پاشی دووسێ رۆژ بەدزی من حەبەکی ژەهراوی لەزراعەی دەینی و لۆی دەهاوێتە ناو پارچە گۆشتەکی، وەکی زانیم سەیەکەم روحی دەدا، هەموو دنیام لەپێش چاوی تاریک بوو، لەگەرتووڕەیی وهاوارم هەموو دیبەگە گێیان لەدەنگم ببوو، کەنتۆرم شکاند، رایدۆنی بابم هورد کرد، جامی سەیارەکەی زراعەشم لێ کردە بڕووش، چوومە ماری مامم، هەرئەوشەوی خەبەرم لۆهات بابم کۆترەکانیشی لێ سەربڕیبووم، راست لەورۆژیەوە کو رۆیشتم دیبەگەم نەدیتەوە بەچاوم. تیپە وێنەی ئەلبوومی چاوەکانی بۆ نەدەکرانە ووشە خۆڵەمێشیەکان، پڕبوو لەدۆزەخ و نەیدەزانی گڕ بخاتە رستەوە، پڕبوو لەشەققەی باڵی کۆترەکانی و نەیدەزانی سروودی بەیانیانی ئەوان بڵێتەوە، نەیدەتوانی ئاسمانی غەمگینی بێ فڕینی ئەوان لەخوێنی تەڕی خۆی

دەربێنێ، تیپە پڕبوو لەکەندێناوەی زام و برین، پڕیش بوو لەعیشق و بەسەرهات، هەموو رۆژێ لەناخەوە باڵندەی رۆحی دەفڕینەوە کەندێناوەو دەبۆوە شوان، دەگەڕایەوە سەر کۆنە عەرەبانەو بۆدی و ئاسنەکانی بۆیەکەم جار گوجیلەکە لێی دەمرڕاند، کەیەکەم پارچەنان کردنی بەهاوڕێی ئەبەدی، هاوڕێی مان و مردن، بناربنارو زنارزنار پێکەوە، گوجیلەیەک نەدەیزانی تووڕەبێ و نەدەیزانی درۆ و دزی و نەدەیزانی واز لەوەفاو خۆشەویستی بێنێ، تیپە نەیدەویست بچێتەوە بەرئاوێنەی کۆن، بەر هەمان سێدارەو رۆح کێشان، کەچی باڵندەکانی رۆح هەمیشە دەیانبردەوە بەر ئەو پەنجەرانەی کەپڕبوون لەباغی وێران لەگوڵی مردوو.

شکۆ و تیپەو مام بڕهان، سێ راگوزەرو پەڕاگەندەی دەستی قەدەربوون، لێرە گیرسابوونەوە، سبیانان زوو ئاوازی رادیۆکەی مام بڕهان بێدەنگی دەکردن و چاو ماست و هێلکەو سەموونیان دەکردە خوانێک، ئەو زستانەش هێدی هێدی بەسەردەچوو، بەلام سەرما لەبەر کورەی فافۆنەکە پێی نەدەهێنایە گارگەکەوە، بۆ شکۆش پڕبەبەری بوو، جێگەو کارو هاوڕێی باشی بۆپەیدابوو، رۆژ دوای رۆژیش گەورەتر دەبوو و بەرگی منالی فڕێدەداو پیاو بوون و ئیرادە لەناخ و دەروون و چاوەکانیدا دەردەکەوتن، زۆردڵخۆش بوو بەئیش وکارەکەی، ماندی بوونیش رێگربوو لەهەڵدانەوەی بیرەوەریەکانی، هێدی هێدی هاوینیش دەبووە میوانی هەولێر، هەولێری سێبەرو نان و برایەتی، هەولێری قەناعەت و دڵ گەورەو چاوتێرو رەسەنایەتی، هەولێری هەمیشە دەست و دڵ کراوە، هەمیشەش خەنجەری ژەهراوی لێدراوە.

عەسرێک تیپە خەریکی کۆکردنەوەی جل و بەرگەکانی بوو، دیاربوو بەرگی دەرەوەی حازر دەکرد،

شکۆ: دەرێی بەتەمایی جێیەکی ؟.

تیپە: دەڕۆم ماوەکم پێدەچی و دێمەوە.

شكۆ: دەچیەوە کەندیناوەی ؟ سەر لەداکت و بابت دەدەی؟.

تیپە بەزەردەخەنەیەکەوە: نانا، سەردانی هەندە برادەرم دەکەم.

شکۆ: زۆرت پێدەچی؟.

تیپە بەزەردەخەنەیەک: دووسێ مانگ.

شکۆ: ئۆۆۆۆ، زۆرە !، بەرام حەزم لێیە زوو بێیەوە.

مام برهان رووی لەشکۆ کردو: کورم ئەوە یەکەم جاری نیە، تیپە وەکی تەیری گەڕۆکە، ئەگەر ئەو گۆزە گۆزەی نەکردبایە، ئەلعان شەهاب لەجێی خۆی دایدەنا، لێی گەڕێ کورم، ئەوەی بزانم پایزێ دێتەوەو بەگەرموگوڕی دێتەوە سەر ئیشەکەی.

تیپە پێڵاوە توندو تۆڵەکەی لەپێ کردو لەگەڵ بانگی شەوێ ماڵئاوایی کردو گووتی چاوەڕێم بن دێمەوە.

هاوینان ئیشی کارگەکە هەندەک ناخۆشتر دەبوو لەبەر گەرما، بەلام شکۆ بەردەوام بوو و سەرەڕای ئەوەش هەندێک جار لەگەڵ شەهابی خاوەن کارگە دەرۆیشت بۆ ساغ کردنەوەی کەلوپەلو بەرهەمەکانیان، ئێوارەش کەدەگەڕایەوە شەهاب رۆژانەیەکی جیای دەدایێ، شکۆش لەگەڵ دەستی خۆی میوەو شەوچەرای دەهێناو لەکاتی بێ ئیشیدا بەدەم قسەو یادەکانیانەوە دەیانخوارد، هەندێک جاریش کەبەرهەم زیادی دەکرد، یان فافۆن نەگەیشتبایە کارگەیان دەوەستاند، ئەوکات دەبوایە بەدیار پەنجەرەی رابردووەوە دابنیشن، ئێوارەیەک مام برهان پشتی بەبالیفەکەیدابوو و دەستەکانی خستبووە پشت سەری، چاوی کزی مۆلەق وەستابوون، بێ جولەو بێ دەنگ گوێی بۆ فڕینی باڵندەکانی سەری شل کردبوو، شکۆش تامەزرۆی بیستنی بەسەرهاتەکانی بوون، ئەویش هێدی هێدی خزایە نێو کارەساتەکانی.

مام برهان دوکاندارێک بوو پشتی بەپیرە قەراتێ دابوو، تەشت و مەنجەرو سێنی و قاپ و کەوگیری هەر لەوکارگەیەی شەهاب دەکڕی و

لەدوکانەکـەی دەیفرۆشـتنەوە، بێجگەلـەوەش بەلـەحیمی قـەراو دەزگایـەک ئیشـی چاککردنـەوەو پـەرچ و تیـژ کردنـەوەی چـەقۆو هـوردەوارەی دەکـرد، خێزانێکی بەختەوەربوون، خودا هـەم کچ و هـەم کوڕی پێ بەخشـی بـوون، (بـەفران و ئـازاد) دوو پەپوولـەی ماڵەکـەی بـوون، دووئەسـتێرەی ئومێدی بــوون، خێزانەکەشــی ژنێکــی میهرەبــانی نــەرم و ئاســوودەبوو، مــاڵێکی پڕخۆشەویسـتی و هیـواو ئومێد کۆی کردبونـەوە، سـبیانان منداڵـەکان زوو لەخەو هەڵدەستان و خۆیان ئامـادە دەکرد بۆ قوتابخانـە، بـەفران کـەزی بۆ دروووسـت دەکـراو ئـازادیش جـل و بـەرگی بـۆ ئوتـوو دەکـراو رۆژانـەیان وەردەگـرت و دایکیـان تـا دەرگـاش بـەڕێی دەکـردن، هـەردووک توورەگـەی کتێبیان دەکردە شـان و نیوەڕۆ کەدەهاتنەوە سەرەڕای هیلاکی نەرمـە بزەو خەندەیەکیشیان پێوەدیاربوو، هێشتا دانەنیشتبوون دەیانگووت: چمـان هـەیە ؟.

هەموو ساڵێک یەکەم دەبوون، بەفران حەزی دەکرد ببێت بەمامۆسـتاو ئـازادیش حـەزی لەئەنـدازیاری بـوو، مـانگی رەمـەزان دێت و بڕهـان زووتـر لەجاران دەهاتەوەو خوانی ئێوارەیان رێک دەخست، نزیک بوونەوەی جـەژن هـەمووانی دڵخۆشـتر کردبـوو، بۆیـەش بڕیـاردەدەن بـۆ جـەژن بڕۆنـە مـاڵی باپیرەیـان لەکەنـدیناوە، لـەدووایـن رۆژی بـەڕۆژوو بوونیـان بـەیانی زوو سـەفەربەرەو کەنـدیناوە دەسـت پێدەکات و لـەڕێگادا رووداوێکـی هـاتووچۆ ئەستێرەکانی بڕهان دەکوژێنەوە، گەلابەیەک کۆنترۆڵی لەدەست دەداو دوای چل رۆژ بڕهـان چـاوی بێ کەسـی دەکاتـەوە و دەبینێ هـەمووان بـەجێیان هێشتووەو خێزان و منداڵەکانی بۆئەبەد رۆحیان هەڵفڕیوە، لەو رۆژەوە مـام بڕهان ناگەڕێتەوە ماڵە تەنهاکەی و بڕیاری تەنهایی دەدا، نایـەوێ گـەڕەک و شەقام و شۆستەکان ببینێتەوە..

شــکۆش یەکــەم هــاوینی هــەولێرو کارگــەی فــافۆنی بەســەربرد، لەزەحمەتیــەکان راهــات و ئیــرادەی بــەهێزکردن، دوای پێداویســتیەکانی

ڕۆژانــەکانی دەگــرتن و زوو زووش مــام بڕهــان بــەبیری دەهێنــاوەو پێــی دەگوت: کوڕی خۆم، ئـەوها بگربـەو ڕۆژەک دێ بـەس پارە بەکـەلکت دێ، عەیامەشکە تەواو لەغـەم دەچیە دەرێ و پێویستیت بەسـوکنە دەبی، کوڕی خۆم کـەس لـەتاریکایی نامینیتـەوە، بـەرام دەبـی بـەڕێ وجـێش بـین، هـەر تەمەشایی بەرپێێ خۆمان نەکەن وهەندۆکەک دوور تەماشاکەین.

تاریک و ڕوونی بەیانیەک لەنێوانی شیشە ژەنگاویـەکانی سـەردەرگای کارگەکە، تیپە بەدەنگێکی دزانە بـانگی کرد: مامـە بڕهـان، شـکۆ، دەرکـەم لـێ بکەنەوە.

شکۆ بەخێرایی دەرگاکـەی لـێ کردەوەو باوەشـیان لەیـەکترداو لەگـەڵ مـام بڕهــان یــەکتریان مــاچ کــرد، جەمەدانیــەکی بــەگورینگی بۆمــام بڕهــان هینابوو.

مـام بڕهـان: تیپەکـە ئـەوجا بەسـە، داکاسـێ و لەسـەر ئیشـەکەی خـۆت ستربە، هـەرگۆز هـەرگۆز بەسە.

تیپە بەنەرمە بزەیەکەوە: تـەواو تـەواو، بـەخوای دەسـت بەئیشـێ خـۆم دەکەمەوەو ناچمە هیچ جییەکی.

گرەگرێ کارگەکە، شکۆو تیپەو مام برهانی سەرقاڵ کردبوو، دەرگایی بیرەوەریەکانی پێ داخستبوون، شاریش بێ خەبەربوو لەوەی قاپ و مراک و کـــەوگیرو مەنجـــەرو تەشـــتیان بەرهـــەمی دەســـتی مانـــدووی ئـــەو سەرگوزشـتانەیە، بـێ خەبـەر لـەوەی کارگەیـەک ئـازاری لـێ دەچۆڕێتـەوە، ئـەوان خوێنیـان پـڕە لەئەسـتێرە، پـڕن لـەگوڵی وێران، لەباڵنـدەی موسـافیر، دونیـاش کـش و مـات نووسـتوو. جارجـار قـوڵاپێکی تیـژ ڕۆحـی شـکۆی رادەکێشـایەوە نێـو گـۆمی خـوێنی بیـرەوەری، ژەهرێـک دەڕژایـە نیگـایی و سـۆمای خـاڵی دەبـوون لـەڕووناکایی، لەسـەر کـەناری خـۆی دادەنیشـت و ڕەوە باڵندەیــەک دەهاتنــەوەو نامەیــەکیان لەگــەڵ خۆیانــا دەهێنــا، وێنــەی ئــەلبومی ئەوسـایی تێـدابوو، چەنـد بەتامـەزرۆیی تێیـان رادەمـا، شـەوێک

لـەجاران زووتـر ئیشـەکەیان تـەواوببوو، تیپـە نیـازی دەرەوەی هـەبوو!، خەریکی قایم کردنی قەیتانی پێلاوەکانی بوو، شکۆش بەچرپەیەکەوە داوای لێ کرد لەگەڵی بچێت، تیپە کەمێک داماو پێی گووت زووکە خێرا پێراوەکانت لەپێکە، هەر لەنزیکی کارگەکە لەتاریکاییەک، تیپە سەیرێکی ئەملاو ئەولای کردو بەدەنگێکی دزانەی شەوانە: شکۆی برام خۆ باش دەزانـم ئەتوو جێی هومێدێی، بـەرام هەنـدەک شـتت پـێ دەرێـم، دەزانـی ئـەلعان ئـەمن و تـوو بکەویتە دەست ئەو حوکمەتەی بەبێ قەیدوشـەرت دەمـانکوژن؟ خۆ دەزانـی ئەلعان عارەب و مارەبی بەغدایی حوکمی هەولێرێ دەکەن و حاکمی رەشـن ؟ لـەپاش نسـکۆی شۆڕشـی مەلامسـتەفای بـارزانی، بەغـدا بوویتـە ئـاش و کوردی وەکی باراشـی لێدەکەن!، کوشـتنی کوردەک و مـارەزیوەکی وەکـی یەکـە!، هەرلـەخوایان دەوێ درەنگـانی شـەوەکی بتگـرت، مەیتەکەشـمان بـزر دەکەن، کەسیش بەهانای کەس ناکـەوی، قەسـاب خانـەیان دانایـەو شـەو نیـە کوڕەکی ئـەو هـەولێرەی نـەکوژن، هـەرچی پیاو کوژو عـارەبی خۆنەشـۆرو خورما خۆری ئەو عێراقەی هەیە هینایتیانە هـەولێرێ، ئەوجـە ئەگـەر حـەزت لەو ژانەسـەرەی نیە لەهەوکەوە بگەڕێوە».

شـکۆ: گەڕانـەوەی چ !، بـەرام دەریـم ئەگـەر دەسـتمان وارا نەبایـە باشتربوو، وای لۆ دەمانچەکی !،

تیپە دەمانچەیەکی لەبەر پشتێنی دەرهێناو گووتی: خەمی هیچت نـەبی، بـەرام لـەمن دانـەبڕێی، لەهـەر جێیـەک دەنگیـان لـێ کـردین، ئەگـەر لێکیش دابـڕاین دِەبـی بەشـێوەک خۆمـان بگەیێنینـەوە کارگـەی ئـەوان شـوونمان هەرنەگرن».

تیپـە ئەوەنـدە شـارەزابوو، لـەتاریکی و کـون و کۆلانـە باریکەکانـدا بـەرپێی خـۆی دەدیـت !، تـەواوێک رۆیشـتن، گەیشـتنە کۆلانێـک هـەموو خانووەکانی کۆن بوون و دیوارەکان لەکەرپووچ و خشـتی قوڕ درووسـت کرابوون، هەندێکیان ریزی سـەرەوەیان لەبەر کۆنی و بـاران سـوابوونەوە،

لەبەینی دووخانوودا گۆڕەپانێکی تاڕادەیەک گەورەو گونجاو بوو، خەڵکی کرێکارو حەمباری ئەوێ کردبیانە جێی کەرو عارەبانەکانیان، خۆیان دایە پەنای عارەبانەیەک و دزانە هەرقونجان.

تیپە سەری بردە بن گوێی شکۆوبەچرپەوە پێی گوت: شکۆی برام ئەمن کچەکم دەستنیشان کردیەو بڕیاریشماندایە، بەرام هێشتا هەندەک کۆسپمان لەپێشە، ئەوجە قەدەرەکە نەمدیتیە، دەمەوێ ئەلعان بیبینم.

خانووێیکی کۆنی سەردەمی داگیرکاری هۆلاکۆ، دیوارەکانی ماندوو و هەندێک شوێنی وەک پیرە پیاوێکی پشت چەماوە، دەرگایی حەوشەکە سیخناخ لەژەنگ و ژوورەکانی سەری بەکاریتە گیرابوون و درێژببوونەوە هەیوانەکە، شەقی کاریتەکان لەبەر گلۆپە کزەکەی بەرهەموان لەدوور دیاربوون، قاندرمەیەک لەحەوشەوە هەڵچووبووە سەربان، پایەکانی لووس ببوو و خەریک بوو هەرنەمێنن، تەندورێکی قوڕ لەناوەندی حەوشەکەوە بوو و لەولاتریش ئەسباب و کەرەستەی پێلاو بۆیاغ کردنیش لەترسی باران خرابوویە ژێر قاندرمەکەوە، دیاربوو کەسێکی ئەو ماڵە بۆیاغچی پێلاو بوو لەبازاڕ، چەند گوشێکی ئارد لەیەک دوورابوون و بەرهەیوانەکەیان پێ داپۆشرا بوو، دوو کەونە تەنەکەی روونی بەشیش و تێل لەبن کاریتەکان کوترابوون، جارجار دوو کۆتر بوغەبوغیان تێدا دەکرد، لەتەنیش خانووەکە، ژوورەکی بچووکی شڕو شەپڕێو درووست کرابوو، پلێتەک بەدەرگاکەی وەندرابوو، پیاوە حەمبارەکەی بەرامبەریان دیاربوو شەوان کەرەکەی لێ دەبەستاوە لەترسی سەرما.

تیپە ژووری کەرەکەی لۆ ببووە قاندرمەو بەئاسپایی پێی هەڵگەڕاو شکۆش بەدوایدا، تیپە بەپەلوکە بەردان لەگوشکەکە دەداو ترپەی دەهات، لەبەر بێدەنگی شەو ترپەی بەردەکە لەئاستی خۆی زیاتر دەنگی دەهات، هەندەی نەبرد لچک و سوچێکی گووشەکە هەڵدرایەوەو کیژێک لەشێوەی مانگ سەری لێ هێنایەدەر !، تیپە ئەوەندە لەوشوێنە چاوەڕێی کردبوو، بۆیە

زوو سەیری شوێنی ئەوانی کرد، تیپەی ناسی و بەهێواشی گوشەکەی دادایەوەو بەقاندرمە سواوەکە هێدی هێدی و بەئەسپایی بەسەرکەوت، کەنزیک بوویەوە هەڵوەستەیەکی کرد! چونکە یەکەم جاربوو تیپە کەسێک لەگەڵ خۆیی ببات، کیژێک وەک مانگ تریفەی پێوەبوو! ئەوەندە جوان بوو، جل و بەرگە کۆنەکانییشی بەجوانی خۆیان نیشان دەدا !، تازەش لەخەو هەلسابوو، بەلام سرووشتی خۆی مرۆڤی رادەچڵەکاند!، سپی وەک بەفری کوێستانان برۆ باریکەکانی لەسەر راکشابوون، چاوەکانی گەش ! پڕبوون لە بازنەی ڕەنگاو ڕەنگ، برژانگەکانی یەک یەک راوەستابوون و جارجار خۆیان لەیەک دەداو دەکرانەوە، لێوەکانی وەک پەڕەی گوڵێکی پەمەیی، بالا باریک و ناسک، هێشتا زیاتر نزیک بۆوە لەتیپە، دیاربوو هەناوی پڕبوو لەقسە و دەمێک بوو دیداریان نەببوو، تیپە شکۆی پێ ناساندو لەگیرفانی خەناوکەیەکی دەرهێناو خستیە نێو لەپی دەستی و

بەچرپە پێی گووت: فەرزانە گیان ئەو ماوەیەی ئیش وکارم گەلەک زۆربوون، لێرەش نەبووم، ئەو خەناوکەیە ناوی هەردووکمانی تێدایە، یەقینیش بە لۆیەک دەبین، هەولێر ئازاد دەبێتەوەو لەئازادیش دەتکەمە بووک، دەبی ئەو رۆژی هەموو هەولێری بکەمە ئالای کوردستان.

فەرزانە: دەزانی لەوەتی دەتناسم هەرئەو قسانە دەکەی، کوڕە ئەوە خەونە خەون، وەرە بمخوازەو لێرە دەڕۆین، بەحەموو تشتێکت رازیم، هەر جیگەیەک دلی تووی پێ خۆش بیت من رازیم.

تیپە: تخوا بەس پەلەم لێ مەکە، قەدەرەشکە سەبرم لێ بگرە، ئەگەر کوردستان ئازاد نەبی قسەی پیاوان دەتخوازم و دەڕۆین، ئەخر ئەلعان پارەشم تەواو نیە.

فەرزانە: تیپۆ گیان حیاتم، توو کەس و کاری من دەناسی، ئەوە ماڵ و حاڵمانە، ئیمە داواکاری و ماڵ و شتمان نیە، لەقەدەر خۆمانین، خوشکەکەی

تریشم ماوەیەکە مێردی کرد، حەربەجلکێ بەری رۆشت، بەخوای توو بڵێی لەگەڵت دێمە گوندەکەشتان،.

تیپە: دەزانم فەرزە گیان، سەبرەکم لێ بگرە، بەخوای دەستبەرداری هەموو دنیایێ بم دەست بەرداری توو نابم،. .

شکۆ و تیپە بەئەسپایی و خۆپارێزی بەکۆڵانە تاریک و باریکەکاندا گەڕانەوە کارگەو چوونەوە سەر جێگاکەیان،

شکۆ بەچرپەیەکەوە سەری بردە بن گوێچکەی تیپەو پێی گوت: پرسیارەک سەری گێژ کردیمە ؟

تیپە: سبەی پێکەوە قسەی دەکەین، جارێ بابنووین.

بەیانیەکەی دووای کێشتەخەو، لەبنمیچێکی کارگەکەدا تیپە باسی جیهانێکی تری بۆکرد، بەدەر لەوجیهانەی شکۆ تێیدا نغرۆ بووە، بەدەر لەوباڵندانەی هەمیشە لە گۆمی بیرەوەری کەندێناوە زامەکانی بۆ دەهێننەوە و بەهەناسەی پایزی ئەوێ ئومێدی ژیان و هەلسانەوەی لێ دەوەرێنن،.

تیپە باسی هەولێری بۆ کرد، ئەوهەولێرەی دووای نسکۆی شۆڕشێکی سەرتاسەری دووبارە داگیردەکرێتەوەو کچانی شۆخ و شەنگی لەچەک بەسەری کۆڕی بیری دادەبڕێنن لەکانی ئاو و گوڵەباخ و چیمەنی کوێستانە رەنگینەکانی باب و باپیرانیان، خەڵکی هەولێر دەبێتەوە کرێگرتەو عەرەبی خۆنەشۆری خورماخۆری بیابان دەبێتە خاوەنی قەڵاو منارە، باسی رەنگی ماتەمی هەولێرو شاربەدرو هەڵواسینی لاوان و زیندان و پەت و سێدارەی بۆدەکات، باسی ئەوکوڕە هەولێریانەی بۆدەکات کە دووای هەژدە ساڵی بەزۆر راپێچیان دەکەن و دەیانبەن شەڕی ولاتانیان پی دەکەن و ئەوەی سەرپێچی بکات گوللەباران دەکرێ، باسی ئەوهەولێرەی بۆکرد کەوەک مانگ تریفەی خۆی لێ وون بووەو خوێنی لێ دەچۆڕێتەوەو سروود ومۆسیقای لێ سەربڕاوە و سەیری مردنی خۆی دەکا، هەولێر وەک کچێک ژەهری خواردبێ و مردبێ، وەک برینداڕێکی بەخوێن و زام، وەک کتێبێکی

پیرۆز سووتاو، داگیرکەرانیش بەخەندەی وەحشیانەیان بۆنی بارووت و بیابان و خوێنیان لێ دێت، حەزیان لەوێرانی و ئێسک و پرووسک و بۆن کروزی خاکە، ئاڵودەی ئەتکی گوڵ و بەهارو بنارانن، ئەوان لەبیابانەوە هاتوون، حەزیان لەسواری هەسپ وشمشێرو رژانی خوێنە، شادن بەناڵەی برینداران، شادن بەشین پڕن لەڕق پڕن لەقین».

باسی سارێژ و هەڵسانەوەو بەرەنگاری و قوربانیدانیشی بۆ کردو ئاڵای کوردستانیشی پێ ئاشنا کرد».

بێ سێ ودوو شکۆی هێنایە پرسیاری بەرەنگاری.

تیپەش باسی شۆڕش و شێوازی نوێی بەرەنگاری و کۆک بوون و کۆکرنەوەی فەرماندەکان و گەرموگوڕی تازەی بۆکرد».

شکۆ: خۆ ئەتوو هەژدە سارت تەواو کردیە، ئەگەر بتگرن چت لێ دەکەن ؟.

تیپە بەخەندەیەکەوە: بەزۆر خەرکی ئەو هەولێرەی خڕدەکەنەوەو لەبەرچاویان دەمدەنە بەر گوللان، هەتا چاوی خەرکی بشکێنن و ببنە پیاوی ئەوان، لۆ ئەتوو پێت وایە ئەمن هەرلەبەر رۆژانەکەی هاتیمەبەر کورەی فافۆنی ؟، ئێرە لەبۆمن لەکونێ ماریش باشترە، هەر لێرەش بزماری وەهایان لەبن پێی دەکوتم هەتا هەتایێ جێی بزر نەبی، شەهابی تورکمانیش بەختی گەورەیەو خوا دەرکەی لێ کردیتەوە، خۆ رۆژانەشم نەداتێ ئەو ئیشەی هەرلۆدەکەم».

شکۆ: ئەدی ئەو هاوینەی لەکێ بووی ؟.

تیپە بەنەرمە خەندەوە: لەشاخ، لەو دنیایەی کەئەتوو هەتا ئەلعان درکت پێ نەکردبوو، ئەگەر ئەوێ ببینی ئەوجا دەزانی کێ ساحێبی ئەوهەولێرەیە، لەوێ وا لەشکر رێکدەخرێنەوە، لەشکری بادینان و سولێمانی و هەولێر، کەندێناوەش لەشکری هەیە، ناسیاریشن».

شکۆ: ئەدی لۆ هاتیەوە ؟.

تیپە: ئەوەندەی لێرە بەکەلکم لەوێ بەکەلک نیم، کوو ئەوان چاوی خەرکی دەشکێنن و لەجادەی خەرکی دەکوژن، دەبی ئەوهاش چاویان بشکێنین و لەجادەی بیانکەینە پەند، ئەگەر ئەمن لێرە نەبم کێ رێ و جێیان پێدەزانی ؟ کێ دەزانی کوو دێن و دەچن ؟.

شکۆ: قەت دەستت لێ وەشاندینە ؟

تیپە بەخەندەیەکەوە: ئەرێ وەلا ماوە ماوە مارکوژیان دەکەم، هەرهەندە یەکیانم نیشان کرد، بەرنامەکی لۆ دادەنێم و قیرەی دەبرم».

شکۆ: حەزم لێیە ئەمنیش لەگەرتان بم، بمبە لەگەرە خۆت».

تیپە: شکۆی برام دەزانم جێی پشت و پەنایی، لەتوو راستگۆترو خاوێنتر مەگەرخوا !، بەرام ئەوها نابی، دەبی لەشاخ لەوێ فێری چەک و شەرو تەقەو دەستکردنەوە ببی، فێری خۆشاردنەوەو خێرا بزربوون ببی، ئیشی ناوشار جیاوازە لەشەری چیاو چەکی گەورە».

شکۆ بەپەرۆشیەوە: ئێ لەگەرخۆت بمبە، دوائیش پێکەوە دێینەوە.

تیپە: ئەو ئیشە بەپەلە پەل ناکرێ، دوائیش جوابت دەدەمەوە.

ماوەیەک تێپەری، شەوان بەدیار کورە گەرمەکەی فافۆن و جارجارەش گێرانەوەی یادەوەری شەویان بەرێدەکرد، جارجارەش تیپە تاریک و روونی بەیانیان دووای کوژاندنەوەی کوورە، پێلاوە توندو تۆڵەکەی لەپێ دەکردو خۆی دەپێچایەوەو بزردەبوو!، پاش بانگی ئێوارە دەردەکەوتەوەو دەیگووت: ئەوە بەئیشیش راگەیشتمەوە، مام برهانیش کەمێک بەگرژی سەری لێ بادەداو دەیگوت: کورم لۆخۆت دانیشە گۆزەی ئاوێ لەرێی ئاوێ دەشکێ.

ئێوارەیەک هێشتا گورگ و مەر لەیەک جیادەکرانەوە، تیپە بەهەشتاوی خۆی کردەوە بەکارگەو بەرگی ئیشی لەبەرکردو بەبن لێوانیشەوە بەشکۆی گووت: تێکەولێکەک هەیە، ئەگەر حەزت لییە پێکت دەکەین.

تیپـه نەخشــەی سەرســەرانییەكی دیكـەی دارشـتبوو، بـەلام هێشـتا پێویستی بـەوردەكاری مـابوو، پیـاوكوژێكی گـەورەی داگیركـەران، كەپێشـتر دووجـار هــەوڵی كوشـتنی درابـوو و بــەلام بـەموعجیزه دەربـازی ببـوو !، جـارێكیش لەشـەڕێكدا دەشـكێن و بەبرینـداری خـۆی دەمرێنـێ و دەربـازی دەبێت، پیاوێكی زۆر فێڵبازو هەشیاربوو ! بۆنی پێش تەقەو نائـارامی دەكرد !، ئەوەندەی پیلان دارشـتبوو بەدەگمـەن دەكەوتـه بەرقاشـوو، لەشـەڕی دوو وڵاتـی تـر بەشـداربببوو و تـەنها بـۆ سـەركوت كردنـی كـوردان نێردرابـووه هــەولێر، هــەموو كــون و كەلەبــەرێكی شــاریش شــارەزاببوو!، تیپــۆ و هاورێكانیشی زانیاریان دەست كەوتبوو كەهەموو پێنج شـەممەیەك بـەیانیان ســەعات هەشــت دەچێتــه قوتابخانەیــەك و بۆچەنــد دەقیقەیــەك ئــالای داگیركاری بەغدا بۆ منداڵانی كورد هەڵدەكەن و بـەزۆر سـروودی خۆیانیـان پـێ دەڵێنـەوە، رێژنـه گوللەیـەكیش بـەئاسـماندا دەتـەقێنن، تیپـەش دەیویسـت زیاتر بچێته بنجوبنەوانی و بەبەغداو داگیركەران بڵێ ئیرادە باشترە لەهێز.

تیپه دەیویست شكۆ بنێرێته بـەردەم قوتابخانەكەو لـەوێ بیكا بەشـێلم فرۆش، تا زانیاری تەواو و درووستیان دەستكەوێ.

تیپه: بەوزووانه عارەبانەكی شێلم فرۆشتن حازر دەبی، لـەوێ شـێلمی خـۆت بفرۆشـه، بـەرام خافرنـەبی، هـەردەم چاوەكت لـەپێش دەركەكـەی بی، پێنج شەممانیش چاوەكت دەكەیه هەزارچاو، دەبی بزانی (سـعد خفـاش) كو دێت و كوش دەڕوا، چەند چەكداری لەگەرە و چەند لەگەری دەچنـەژۆرێ و چەندیش لەدەرێ دەمینێنەوە و چەندیان پێدەچی.

شكۆ بەخەندەیەكەوە: هەرئەوەندەش ؟.

تیپه: جارێ ئەوە (لێ لێ ) یه، هێشتا (لۆلۆ) ش دەمینی.

دووای دوو رۆژ عەرەبانــەی شــێلم فرۆشــتن حــازركراو شــوێنی قوتابخانەكەشـیان بەشـكۆی نیشـاندا، بەیانیـەكی سـاردی پێنج شـەممە تیپـه شكۆی بردەوە هەمان كۆلانی ماڵی (فەرزانه) ی دولبەری، لـەماڵێكی ئەولاتر

عەرەبانــەی شــێلمەکە ڕاگیرابــوو و هــەڵمی گــەرمی لــێ هەڵدەســتا، عەرەبانەیەکی سێ تایەیی سندووقیکی گەورەی لەسەر چەسپ کرابوو و دەرگایـەکی لەپشــتەوە هــەبـوو و تــەباخێکی تێدابوو تـا شـێلمەکە سـارد نەبێتەوە، چەند قاپێک و پەرداخ و تـەدارەکی شێلم خواردنیشی لەسەربوو، شکۆ پاڵی بەعەرەبانەکە ناو تیپە ئاوڕێکی لێداوەو بەخەندەیەکەوە: لەپارەی شـێلمیش شــەریکین هــا. تیپــە گەڕایــەوەو شــکۆش هێـدی هێـدی پـاڵی بەعەرەبانەکــەوە دەنــا، گەیشــتە پــێش دەرگاکــەو دوو دوو کیژۆڵــە ســەربەقردێلەکـان دەهــاتن و جانتاکانیـان لەپشـتیان قـایم کردبـوو، کـراس وگۆرەویەکانیان سپی وەک ڕۆحی خۆیان، کوڕەکانیش ورد ورد هـەنگاویان دەبڕی و هەنـدێکیان پەنجەوانـەیان لەدەسـت وچـەتریان پێ بـوو، شـکۆش جێگــەی گونجـاوی بـۆ عەرەبانەکــەی کـردەوە، لــەپڕ لەســەری کۆلانەکــەی ئەوبــەر شــێلم فرۆشــێک پــاڵی بەعەرەبانەکــەی دەنــاو دەهــات، پیـاوێکی چارشـانەی بێ ملـی زرپەسـتووری ســەرگەورە، باسـکی دەتگـۆ شـوونکە، پشتی دەتگۆ دیواری مەشکانیە، هێشتا نەگەیشـتبوو سـەرو کـاپێلکی بـەدیتنی شکۆی تێک چـوو، سێ چـوار جـار پڕبەگـەرووی ئحـم ئحمـی کـرد، دیـاربوو ئەو شوێنە لەمێژبوو جێی شێلم فرۆشی خۆی بوو، عەرەبانەکـەی ڕاگـرت و چاوەکی لەشکۆی زەق کردەوەوبەتوورەییەوە: مامن دەسارە لێرە شێلمێ یە فرۆشـم، ئەوجا وارێم قەبوریشـن نیە کـەس لێرە کەسابەتێ خۆبکا، بـەخوا شێران لەبن هەنگرێ خۆنێم ئەیخنکێنم، ئەوجا لۆخۆ تێبەگە.

شـکۆ بیرێکی باشـی هاتـە خـەیاڵ و نـەیهێشـت ریسـەکەی لێ ببێتـەوە خـوری وبەنـەرمی وهێمنـی گـووتی: مامـە گیـان ئەمـە هەربەقـەد دووحەفتـە شـێلممان مـاوە، چیـدی ئـەو کاسـبیە ناکـەین، بـابم دووکانـەکی گـەورەی سـەوزەومیوەی دانایـە، گۆتیشــی ئـەو عارەبانـەی نەینیـەوە، عەرەبانەکـەی تووش زۆرکەونە، ئەوەی خۆمت بەپێ پارە دەدەمێ، بەس ئەو شەش حەفت ڕۆژەی لەسەرم ڕاوەستە.

پیاوە زرپەستوورەکە رەنگێکی گەشی هاتەوەبەرو دەموچاوی پڕبوون لەخەندەو گووتی:هههههە وەڵا عارەبانەکەی من دەستێی لەخۆبەردانە، لەڕێیا هەر خڕەخڕانەکا، ئەوجا چقەیدینا لۆخۆ شێلمێ خۆ بەئیسرەحات بفرۆشن، بەرام وارێم وەعدێ خۆ لەبیرنەچن.

شکۆ بەچاوەڕوانیەوە هێدی هێدی خۆی خەریکی قاپ و کەرەستەکان دەکرد، لەسەری کۆلانەکەوە تەقەتەقی پێلاوێک زەینی راکێشا !، هێدی هێدی نزیک دەبۆوە، شکۆ زیاتر دیقەتی دایێ، وەک گوللەیەکی کت وپڕ، وەک برینێک سەرلەنوێ ببێتەوە بەگۆمی خوێن، ئەو پەیمانەی سەرگوزشتەی یەکەم ئەلیف وبێی ئەوسایی بوو، چەند پەرۆش بوو بیگەیەنێتە کەناری ئارام، هەنگاوهەنگاو نزیکتر دەبوو، شکۆش لەپەنایی عەرەبانەکەیەوە خۆی لێ شاردەوەو بەنهێنی لێی دەڕوانی، دیاربوو هەندێک گۆڕابوو و زۆریشی نەمابوو ببێتە دایک، شکۆ هەستی بەخۆشەویستی منداڵەکەی نێو هەناویشی دەکرد، چونکە ساڵانێک ئەوباوەشە مەنزڵگایی ئارامی ئەویش بوو، بیرەوەری خۆی کرد بەژووری یادو بەسەرهات، شکۆی بردەوە کەندێناوە، ئەورۆژەی پەیمان جوان سەری شووشت و ئەوجل وبەرگانەی بۆی هێنابوون لەبەری کردن، بۆیەکەمجار بوو بەخاوەنی گۆرەوی و پەنجەوانەو چەتری باران.

پەیمان لەدەرگایی قوتابخانە چووە ژوورێ، شکۆ پڕبوو لەتامەزرۆیی گریانێکی باوەشی دایکانەو هەموو کەسەرەکانی خۆی تێدا هەڵڕێژێ.

سەیری ئەو منداڵانەی دەکرد کەدەهاتن و تێدەپەڕین و دەچوونە پۆلەکانیان، یادوبیرەوەری دەبوونەوە بەکارەسات، رەشەبای رەش لەگەڵ دەنگی مەرگ دەهات، بیرەوەری چ لەشکرێکی پایزبوو، چەند پڕبوو لەگوڵی نەفام، چ کتێبێکی دڵڕەق بوو پڕلەیاسای سەربڕینی باغ و نەمام.

هەندەی نەبرد، ئوتومبێلێکی تووڕەی دەنگ ناخۆش، بەنەڕەنەڕ دەرکەوت، لەنزیکی دەرگای قوتابخانەکە وەستاو لەهەرچوار دەرگاکە

لێوەی دابەزین!، پیاوێکی ڕەشی درێژو پڕی چارشانە، کەمێک ورگن، گرژو تووڕە، لچ و لێوی مۆر دەچوون لەڕەشیان، جل وبەرگ زەیتوونی و پێلاو بۆیاخکراو، دەمانچەیەکی توند بەقایشەکەی پشتیەوە بەستبوو، یەکێکیان لای ئوتومبێلەکە مایەوەو دووانەکەی تریش لەگەڵ بەرپرسەکەیان چوونە ژوورەوە، هەمووان پرچەک بوون و وەک گورگی هار بەملاو ئەملایاندا دەڕوانی، زەنگ لێدراو بەخێرایی هەموو خوێندکارانیان لەگۆڕەپانی قوتابخانەکەدا کۆکردنەوە، ئەوەی لای ئوتومبێلەکەش بەجێمابووهێدی هێدی خشیە لای شێلم فرۆشەکەو پێدەچوو هەموو پینج شەممەیەک قاپێک شێلمی خواردبی !، شێلم فرۆشەکە لەترسان سمێرەخنچکەی بۆ دەکردو و زوو قاپێک شێلمی خوێ کردو لەپێشی دانا، شکۆش دەرفەتی هەبوو لەگۆڕەپانەکە بڕوانی، دیاربوو سروودەکان خوێندرانەوەو ئالای داگیرکاری خۆیان هەڵکردو ڕێژنەیەک گولەیان بەئاسمانەوە تەقاند، هەندێک لەپەپوولە قردێڵە سپیەکان بەپەنجە ناسکەکانیان گوێچکەی خۆیان دەگرت لەبەردەنگی نەفرەتی تەقەی تفەنگ، ئەوەندەی پێنەچوو هاتنە دەرەوەو خێرا سواری ئوتومبێلەکەیان بوونەوەو بەتووڕەیی ڕۆیشتنەوە.

شکۆ دەمێکی باش مایەوەو هێشتا نیوەی شێلمەکەی مابوو، بەشێلم فرۆشەکەی گووت: بابم چاوەڕێم دەکاو بەتەنێ ئیشی دووکانێی پێ ڕایی ناکرێ، وەرە ئەوەندە شێلمەی منیش لۆخۆت بفرۆشە، هەریەک دوو تەشتە شێلمیشمان مایە خلاس بی عارەبانەکەت دەدەمێ.

شکۆ گەڕایەوەو عەرەبانەکەی لەشوێنی خۆی ڕاگرتەوەو هەموو سەربەردەکانی بۆ تیپەی هاوڕێی گێڕایەوە، پێنج شەممەی داهاتوو بەیانی زوو شکۆو تیپە بەرەو کۆڵانە دێرینەکە بەڕێکەوتن و هێدی هێدی شکۆش لەتەواوی تەگبیرە دەگەیشت، عەرەبانەکە لەشوێنی جارانی هەڵمی لێ بەرزدەبوویەوە، دەرگابچووکەکەی عەرەبانەیان کردەوە لەجێگەی تەباخەکە دووتفەنگ و تەدارەکەی تێدابوو، تیپە چوویە ناوعەرەبانەکەو بەکورژۆکە

جێی خۆی کردەوە، شکۆش پاڵی پێوەدەنا، کونێکی گچکە لەپێشەوەی عەرەبانەکەبوو، تیپە لەوکونەدا ئاراستەی ڕێگەی بۆ شکۆ دیاری دەکرد، ماوەیەک ڕۆیشتن گەنجێک لەبەردەرگای خۆیان دیاربوو بەپەرۆشیەوە چاوەنوارپبوو، دەستەکانی لەگیرفانی شەرواڵی بوو، دەلینگیشی خستبووە ناو گۆریەکانی، جەمەدانی لەمل گرێدابوو و دەموکەپووشی پێ شاردبوونەوە، باریکو ڕیتەڵە بەلام چووست و توندوتۆڵ، تیپە لەدەرگای عەرەبانەکەوە بەشکۆی گووت: تەواو برۆ نێزیکی !. هەرزوو ئەویش خۆی لەعەرەبانەکە پەستاو لەپێش قوتابخانەکە وەستان، ئەوان لەدرزو کونی عەرەبانەکە دەرەوەیان لێ دیاربوو، هەندەی نەبرد شێلم فرۆشە زرپەستوورەکەش هات و ڕایگرت: وارێم شێلمەکەو خلاس نەکر؟ وەعدێت دابوو، عەرەبانەکەن دەیتێ.

شکۆ: ئائا لەبیرمە، هەرئەوەندە شێلمەی سەرعارەبانەشمان مایە، بابم سەلامی لێ دەکردی، گۆتی عارەبانەکەی لەوێ لۆبەجی بێلە،

بابم گۆتی گەردەنمان ئازاکە.

پیاوە شێلم فرۆشە زرپەستوورەکە لەخۆشیان بەوبەیانیەی بەهەموو دەنگی بەنەرمە شایی و شان هەڵتەکاندن هاواری دەکرد

ئۆخەی ئۆخەی دەرمان کۆخەی، ئۆخەی ئۆخەی دەرمان کۆخەی

جارجاریش ڕووی لەشکۆ دەکردو پڕ بەهەیوانی دەمی دەیگۆت: ئەورۆ ئەوەی کڕیارێ منیشە ئەینێرمە لای توو، با بابێت هەندە چاوەڕێن نەکا.

دیسان مامۆستا پەیمان لەهەمان شوێن دەرکەوتەوە، ئەوجارە لەبەر نەرەنەڕی شێلم فرۆشەکە دیقەتی لێ کردن، زیاتر لەشکۆ ورد بۆیەوەو دیقەتیدا !، دیاربوو کەوتە دوودڵی و گومان!، کەشکۆش تەمەشایی کردەوەو چاوەکانی نەوی کردنەوەو هەناسەیەکی پڕبەسیەکانی هەڵکێشا، پەیمان دڵنیابوو کەشکۆیە، هەرلەوسەین وبەینەش ئوتومبێلی (سعد خفاش) و

جەماعەتەکەی گەیشتن، پەیمانیش ناچار بەئیشارەت بەشکۆی گووت ئێستا کەمێکی تر دێمەوە، پەیمان چووە قوتابخانەو سەعدو پیاوەکانیشی بەدوایەوە، وەک جاران تەنها شوفێرەکە لەدەرەوە بەجێما، ئەویش هێدی بەرەو عەرەبانەی زرپەستوورەکە چوو، بەشێلم خواردن خەریک بوو، شکۆ سەری بردە نێو عەرەبانەکە تابزانێ تیپە لەشتەکان ئاگادارە.

: تیپە یەکیان بەجی مایە ! واشێلمی دەخوا لێت دیارە؟.

تیپە بەدەنگێکی دزانە: ئائا لێم دیارە، ئەلعان لێی دەکەمە قوزەلقورت، با بخوا، بەخوای چیدی پەلکێ نانی قووت نادا.

دیاربوو لەگۆڕەپانی قوتابخانەکەش ئالاکەیان هەڵکردو سروودەکان خوێندرانەوەو لولەی تفەنگ بەرزکرایەوەو رێژنەیەک فیشەک تەقێندرایە ئاسمان، رەشوێرەو کوکوختیەکانی نێودرەختی حەوشەی ماڵەکانی ئەوێی هەڵفڕاند، دیواری قوتابخانەکەش ئەوەندە نەوی بوو شکۆ تەواو حەوشەکەی لێ دیاربوو، دیسان سەری بردەوە نێوعەرەبانەکەو پێی گووتن وادێنەوە دەرێ،.

شێلم خۆرەکەش بەرەو ئوتومبێلەکەیان گەڕایەوە، هەرچواریان لەنێوانی ئوتومبێل و دەرگای حەوشەی قوتابخانەکەوەبوون، تیپەو هاوڕێکەی گەیشتە سەریان و ئەوجارە سعد خفاش پێ رانەگەیشت دەست بکاتەوەو وەک جارانی پێشووش خۆی بمرێنێ، تفەنگی تیپەوهاوڕێکەی هەناسەی رەشیان دەدایەوەو گولەیان لەدەم دەردەپەڕی، ئەوناوە پڕبوو لەبۆنی باروت، پیاوە زرپەستوورەکە بەبۆڵەبۆڵ هەتا پێی تێدابوو عەرەبانەکەی خۆشی جێهێشت، تیپە بەخێرایی چەکەکانی ئەوانیشی کۆکردەوەو گڕی لەسەیارەکەی ئەوان داو هەرسێکیان سواربوون و خێرا ئەوێیان بەجێهێشت.

تیپە شوفێرێکی لێزان و شارەزا بوو، رووینەکردە جادەگشتیەکان و بەکۆلانەکاندا لەشار دوورکەوتەوە، ئوتومبێلەکەیان بەجێهێشت و تەواوێک

دووركەوتنەوەو چەكەكانیان خستەژێر خۆڵ وبەردو هەریەك بەلایەكدا بڵاوەیان لێ كردوو بەپێ گەڕانەوە پیرەشار. شكۆ گەڕایەوە كارگەو گەلەك برسی خەوبوو، بەلام وێنەكانیشی لەبەرچاو و زەینیدا بزرنەدەبوون، كوو ئەوهەموو شتانە وابەئاسانی روویاندا؟، ئەوهەموو پیاوە گەورانە ! خۆ یەكییان نەیتانی و پیرانەگەیشت بەرگری لەمانەوەی روحی خۆی بكا!، ئەدی تیپەو برادەرەكەی؟ چەند دەست گەرم بوون!، خۆ تیپە دەتگۆ تەنكتەری بابی داژوا !، بەڕاست! خۆ شێلم فرۆشەكە هەربەدەشتێ كەت !، چما هەتا عومری مایە دەوێری بریتەكەس شێران لەبن هەنگرێ خۆنێم ئەیخنكێنم !، بەخوای نەك عارەبانەكەی من ! ناوێری لەعارەبانەكەی خۆشی بپێچیتەوە!. پاش عەسرەكی درەنگ مام بڕهان بانگی شكۆی كردو وەئاگای هێنا، هێدی هێدیش خەریكی گەرم كردنی كورەكە بوو، شكۆش بەدەم هێلكەو روون و چایەكەوە هێشتا وێنەكانی بەیانی لەپێش چاویدا دووبارە دەبوونەوە!. رۆژ ئاوابوو تیپەش هاتەوە، مام بڕهان بەدەست وپەنجەی قلیشاوی بەركورەی ئاگرو زەبری فافۆن، دەرگاكەی لێ كردەوە،

تیپە: مامە بڕهان تخوا گەردەنم ئازاكە، ئەمن ئیشەكانی توومم قورستركردیە، گەلەك شەرمەزارتم، ئەوەی ئەتوو دەیكەی باب لەكوڕێ خۆی قبوورناكا.

مام بڕهان گلێنەی چاوەكانی لەرزین و پڕبوون لەفرمێسك، پڕبوون لەمیهرەبانی و خۆشەویستی بۆ تیپە، چاوەكانی پڕبوون لەووشە بەلام زووبانیان نەبوو پێی بلێ: نا كوڕی خۆم تۆ هەمووكات سەبووری بووی بۆم، تۆ نەبایی تەنهایی دەیپێچامەوە، تۆ نەبایی ژەهری ئەوێ رۆژێ خوێنی دەمارەكانی دەخواردمەوە، تۆ سرووودی بەردەوامیم بووی، تۆهاتی و لەژوور سەری تەمەن بووی بەسارێژ، لەكاتێكدا من بێ مانگەشەو و بێ ئەستێرە، شەوێكی تاریك بووم و خۆریشم نەبوو، شەوێك نەبوو لەمن شەوتر، دەرگام لەسەر رووناكی داخرابوو، بەردەوام باڵندەی

بیرەوەریـەکانم دەچوونـەوە سـەر هـەمان خـوان، میـوەی مـەرگیان بـۆ دەهێنامـەوە، تـۆ هـاتی و دەرگاکانـت خسـتنە سەرپشـت، لـەچاوەکانی تـۆوە خۆرم بینی، شەوان خەمەکانی خۆت وەلا دەناو بەخەندەکانتەوە تاریکاییت دەتۆقاندو هێزت دەبەخشیەوە ئەژنۆکانم.

برهان تیپەی لەباوەش گرت: کورم خوا لێمانت نەستێنی.

تیپە: ئەمن مامم هەیە مام، هەتا ئەتووم هەبی نەدەشکێم و نەدەکەوم.

بەخێرایی رویدایەوە ئیشـەکان و تـا بـەرە بـەیان دەسـتی هەڵنـەگرت!، جارجـار شـکۆ خـۆی دەگەیانـدێ و بـەبن لێـوان دەیویسـت پرسـیارێک بکـا، تیپەش دەیگوت: سبەی عەسرێ.

بەیانیانیش هیلاکی خەوبوون و تادوای نیوەڕۆ نووستن.

شـکۆ پڕببـوو لەپرسیاروهێشـتا چاوەکـانی تـەواو گـەش نەببوونـەوەو بەخەواڵیـەوە: ئـەتوو پـێم بـڕێ؟ ئەوتفەنگانـەی بەجیمانهێشـت، کـێ دەیانهینتەوە؟

تیپە: ئەویش خەمخۆری خۆی هەیە.

شکۆ: ئەدی کوژرایەکان ؟ دەبی چ قەومابی پاشەمە؟

تیپە بەخەندەیەکەوە: هەرچی عارەبانچی ئەو هـەولێرەی هەیـە گیرایـە، ئـەوڕۆ لەشـێخەلای عـەمبار بەدەسـت نەدەکەت!، کورە نـەک شـێلم فرۆش ! ئـەوەی شێلمیشـی چانـدبی ئـەوڕۆ دەگیـرا !، هەوکـە ئـەوی رۆژەک پـاری بەعارەبانەی وەنابی دەگیرا ! شەربەت فرۆش، پاقلـە فرۆش، کورە سـەمون فرۆش، کـورە کۆمبارفرۆشـەکانیش ئـەوڕۆ خۆیـان شـاردبۆوە ! خـوادەزانی ئەوڕۆ هەولێر بۆن ساردی لێدەهات !.

شکۆ کـەمێک بەخەمباریـەوە: دەبی شـێلم فرۆشـەکەی تەنیشـتمان چـی بەسەرهاتبی؟.

تیپە: جارەشکە دەوێری تخون شێلمی بکەوی ! نەوەی نەوەکەشی جارەشکە پار بەعارەبانەی وەنانێن!، ئەوجە بریٚ چ ؟ رۆژەک دادیٚ دەرێن ساری عارەبانەکەی.

شکۆ: ئەتوو واز لەوقسانە بینە، پێم بریٚ ئەو کورە کیٚ بوو لەگەرمان؟.

تیپە بەخەندەیەکەوە: ئەوە (هەورۆ) بوو، بابی شەهیدی شۆڕشەو تاقانەیە، دووخوشکی هەیەو لەگەر داکی دەژین، ئەوانە بەبنەمارە پێشمەرگەن، خەرکی ئێرە نینە، لۆئەو مەسەلەیەی ئەورۆ مابۆوە، بەو زووانە دەگەڕێتەوە.

شکۆ: خەرکی کێندەرن ؟

تیپە: ئەوانە هی گوندی (کانی بەردینە) ن، هی لای خۆشناوەتی، زۆر لەولاتری شەقراوەی.

ماوەیەک بەسەرچوون، دۆخەکە کەمێک ئاسایی ببۆوە، تیپە چەند جارێکی تر شەوان بزردەبوو و دەگەڕایەوە، درەنگانی شەوێک زووتر لەجاران ئیشەکانیان تەواوببوو، تیپە نیازی دەرەوەی هەبوو و شکۆی لەگەڵ خۆی برد، پێڵاوەکانیان قایم کردو گورج و گۆڵ بەئەسپایی دەرگایی کارگەکەیان کردەوەو لەدوای خۆیان رایانکێشایەوە، هەرلەنزیکی کارگەکە لەبن کۆنە مێزێکی بیٚ کەلک، مقەبایەک و قونکە فەردەیەک راکشابوون، یەکەو یەکێکیان خستە بن باڵیان، بەنێو کۆلانەکانی بەش مەینەتی غەم بەئەسپایی دەڕۆیشتن، دەیانویست پێڵاوەکانیشیان دەنگی نەبیٚ!، خۆیان لەشەقام و رووناکی گڵۆپی مالان بەدوور دەگرت، ئاراستەی تیپە بەرەو هەمان کۆلانە کۆنەکان و گەڕەکی هەژاران بوو، بەرەو مالی ئەومانگە دەچوو، کەلەمێژبوو تریفەی بەسەر سەراپای شکۆفەی باغەکانیەوە بوو، بەرەو ئەوپەنجەرەیەیی کەمالی دوو کۆتری ئاسوودە بوون، بەرەو دیداری فەرزانەی چاوەڕیٚ.

دونیا کش ومات، جارجار دەنگی بووغەبووغی کۆترەکان، یان پرمەی (کەر) ی حەمباڵەکەی دراوسێی ماڵی فەرزانە رایدەچڵەکاندن ! تەمەشایەکی یەکتریان دەکردو پڕدەبوون لەپێکەنین بەخۆیان.

تیپە بەسەر ژووری کەرەکەدا سەرکەوت و شکۆش مقەباو گوشەکەی دایەدەستی، وەک جاران تیپە پەلوکە بەردۆکەیەکی راوەشاندە گوشی بەرهەیوانەکە، هەندەی نەبرد گوشەکە هەڵدرایەوەو مانگی تیپە بەچاوی خەواڵوەوە پەرچەمی لادان، وەک چۆن هەور بەری مانگ دەگرێت و دەردەکەوێتەوەو زەوی رووناک دەکاتەوە، هێدی هێدی بەقاندرمە سواوەکە سەرکەوت، هێشتا خەو یەخەی بەرنەدابوو.

تیپە: دەزانم خەوت دێ و بیزارم کردی، بەرام هەندەک شەکرو چاو روون و ئاوەتەماتەم لۆتان هینایە، لێرە بەجیدێلم و سبەینێ بیانبەوە خواری.

فەرزانە بەچاو و دەنگی خەواڵووەوە: هیچ قسەی نوێت پێ نیە؟

بەتەمانی بمخوازی ؟ ئەتوو بەتەمایی دنیا لەورۆ خۆشتربی؟ بەقسەم بکە، دایە (بەگم) گۆتی دەبی تیپە لەهەولێرێ بڕوا، کەلکی ئێرەی نمایە، زیاتر بمینیتەوە دەیکوژن.

تیپە: کەینێ دایە (بەگم ) ت دیت ؟.

فەرزانە: ئەورۆ نێوڕانێ شیومان هەبوو، قاپەکیشم لۆی برد، دەیگۆ هەموو حوکمەتی هەولێری لەدوو تیپەن، والی گۆتیتی ئەوەی بەزندینی و بەمردیتی لۆمان ئاشکرابکا خەنی دەکەین.

تیپە بەنەرمە خەندەیەکەوە: کچێ والی بەخۆی ئەجەلی بەدەستێ من هاتیە، وەمەکە سبەی تەشتە گوەکی پێ بکەم، ماوەشکە دەچمەوە چیایی، لەوێ لەگوندەکی قونجەکی پەیدادەکەم و دێمەوە دەتخوازم و دەچینە ئەوێ هەتا لایەک بەلایەکی دەبی.

چلەی زستانێکی تریش بەسەرچوو، تادەهات گەرمی کورەی فافۆنەکە ناخۆشتر دەبوو، تیپەش وەکو پێشوو جارجار بزردەبوو و دەردەکەوتەوە، ئێوارەیەک دەرکەوتەوەو بەشکۆی گووت: نامە لەسەرکردایەتی هاتیەو داوای من و توویان کردیە، بەمەزەندەی من دەیانەوێ ئەتوو لەنێزیکەوە ببینن و دەست خۆشیت لی بکەن، ئەوەی کردمان هەوەنتە نەبوو!، لەهەموو کوردستان دەنگی داوە.

شکۆ: ئەدی ئیشی ئێرە بەجی بێلین ؟ هەتا دێینەوە جێیەکەمان دەگیرێ.

تیپە: چما هەموو هەولێرێ بکەی دوو پیاوی ساغلەمی تێدایە؟، ئەتوو لەو ژۆرەی ئاگات لەدنیایێ نیە!، لەوهەولێرەی لەپیروپەککەوتەی زیاتری تێدانیە! ئەوەی دووپەلی ساغی هەبی حوکمەت دەینێریتە شەڕێ، خەڵک هیچ چارەی نیە یان دەبی ببیتە پیاوی حوکمەتی، یان دەبی ببیتە پێشمەرگە لەوچیایانە، خەمت نەبی جێمان ناگیرێتەوە، زووش دێینەوە.

شەوێکی ئەنگوستەچاو، قەیتانی پێڵاوەکان گرێ دران و گورج و گۆڵ بەنێو کۆڵانە باریکەکانی گەڕەکی برسی و هەژاران و کرێکاراندا تێدەپەڕین، گڵۆپە کزو زەردەکانی بەردەرگا توانای رووناک کردنەوەی ناخی کۆڵانەکانیان نەبوو، ئەوەندە گورج و خێرا هەنگاویان هەڵدەهێنا، هێدی هێدی هەولێر ئازیزترو رێگاش تاریکتر دەبوو، بیلبیلەو گلێنە ئاوڕی پیرەقەلایان دەداوە، تادەهات هەولێر دەبوو بەچەند گلۆپێک..

هەولێر بەجێماو گەیشتنە دەشتە بەپیتەکەی خاتووناوە، بێستانەکان تخوبیان لەسەریەک بوو، کش ومات، جارجار فڕەی باڵندەیەک لەبن دەست وپییان رایدەچڵەکاندن، کەندە درێژەکانی ئەو دەشتە ئاوی کارێزەکانی کەسنەزانی پێدادەهات و نەرم نەرم شۆڕدەبوونەوە، قیڕەقیڕی بۆقەکان دەنگی دەدایەوەو هەموو شتێکی بێدەنگ دەکرد، هەنگاو رووی لەملەزوورگەکان بوو، مەڕدارەکانی گوندی بنەسراوە شەوبەکێویان

لەزوورگەکانی زەرگەتەن خستبوو، زەنگوڵ و قرقرەی ملی مەڕو بزنان، ئەوناوەی پڕکردبوو، هێدی هێدی دونیا رووناک دەبوو و ئاسۆ بەیانی باشی لەهەولێردەکرد، ئەستێرەکان بێ درەوشاوەتر دەبوون، شکۆ وتیپە دەبوو بەڕۆژ خۆیان حەشاربدەن و شەو رێگاکان ببڕن، کەدونیاش رووناک بۆوە مێوانی زوورگە چڕو هەڵەتە رووتەکانی زەرگەتەن بوون، دەبوایە بەدرێژایی رۆژ عەرد قووتیان بداو تێرخەویش بن، هێشتا گیرفانەکان و باخەڵیان پڕنان و مەتارەکانیان پڕئاوبوون، لەنێوانی ملەزوورگەکان کون و کەلەبەری وەها هەبوو مەگەر پەپوولەیەک جارجار سەری لی هەڵبکێشابان!، خەو دەستی دەگرتن و دەیبردنەوە دونیایی خۆی، دەم دەمیش باڵندەکانی خەیاڵ و بیرەوەری لەملە زوورگەکان بەرزدەبوونەوە، شکۆیان دەبردەوە گوندەکەی خۆیان، تا دوای نیوەڕۆیەکی درەنگ تاشەبەردێک دەبووە سەرین و ئاسمانیش پێخەف، دوای خەوێک و پشوویەکی درێژ، دەبوو چاوەڕیی شەوبکەنەوە، تا کاروانی توولە رێگەکە بدەنەوە دەست هەنگاوەکان و چۆک بەچیاو بەرزاییەکاندا بنێن، پەڵەهەورێکی سپی بیرەوەریەکانی شکۆی هەڵدایەوە، گەڕایەوە باوەش وهەناسە گەرمەکانی پەیمان، چەند پەرۆشی گەورەبوونی بوو!، ئەو بۆیە لەگۆڕی دایک و سێبەری باوک و خوشک و گوندەکەیانی دوورخستەوە، تابۆی ببێ بەهەمووان، کەچی هەموانی لێ وون بوون..

شکۆ بەهەناسەیەکی قووڵەوە: تیپە غەریبی کەس ناکەی؟.

تیپە دەستەکانی خستە ژێر سەری و بەهەناسەیەکەوە: کەسانەک هەن لەناخمدا دەژین و دەمینێنەوە، بەرام ئەوەی کەهەمووکات خۆم بەشەرمەزاری دەزانم (هاجەرە) ی خوشکمە، ئەو زوڵمەی لێی کرا قەت لەدرم دەرناچی..

لەبیرمە ئێوارەکێ بابم لەدوو خزمو ناسیارانی نارد، ئەوەندە زۆربوون بەقەرەپەستانێش لەدیوەخانێ جێیان نەدەبۆوە !، بابم کورتەک و

شەروارەکی نوێی لەبەرکردبوو، هەوری لەسەرو تەزبێح لەبەر پژدێن، کێک و شەربەت و پاقلاوە بەژمار نەدەهات، چوونە داخوازی ژنێ لۆ برایە گەورەکەم، هەرلەکۆرانەکی سەرەوەی ماری خۆمان بوو، بابم سەردەستەکانی هەرکردبوو، عەینەن دەتگۆ شێرە لەدارستانێ دەڕوا !، برایەکەشم ئەوەندەی گوراو لەخۆ دابوو، چاردەوری پڕکردبوو!، خزموناسیارەکانیشمان لەولاو ئەولایان دەڕۆیشتن!، بابم لەدیوەخانێ ماری بووکێ چارچمکی لێی دانیشتبوو، بەینا بەین دەکۆخی دەتگۆ گەوارەیە دەگرمێنی، قل قل تەزبێحەکەی ئاوادەکرد، کێخوای حەفت گوندان بەقەد بابم بەشان وشەوکەت نەبوون !، ژن مارەکراو شەربەت و پاقلاوە بەگۆڕێ وەربوو، هەل هەلەی هاجەرەی خوشکم دەتگۆ رێژنە کولەیە لەلوولەی تفەنگێ دێنەدەرێ،

سێ رۆژ پێش گواستنەوەی ژنەکە، بابم مشەوەش ببوو، جلکی نوێی لۆخۆیی و لۆ هەموومان بەڕادان دابوو، سەرجۆخینانی خاوێن کردەوەو پەلووکە بەردۆکەکیشی تێدا نەهێشت و ئاوڕشێنی کرد، چار گیسکی قەرەوی هاوێر کرد لۆ رۆژی گۆستنەوەی بووکێ، تفەنگێ مەعروف ئاغای هیناو خاوێنی کردەوەو فیشەکی شەوێی هاوێشتنە سەرێ، رۆژی گۆستنەوەش سبیانی زوو دۆروزوڕنا کوتای، بابم دەتگۆ پاشایە دەهات ودەچوو، جەمەدانیە بەگورینگەکەی دەلەرینەوە، داکم و هاجەرەی خوشکم سێ رۆژ پێشی خەنەیان لەدەستیان نابوو، داکم کراس و کەوێیەکی گورباتمانی لەبەرکردبوو، ئێوارێ بووک هات، نیوەی کەندێناوەی هاتبوونە دیارێ، شایی بوو سەرچۆپی بەبەر نەدەکەت، رۆژئاوا دۆر دڕا تەقەی بڕا، برایەکەم لەگەر بۆکێ چوونە ژورێ، تەواوەکیان پێچوو !، بابم دری توندبوو!، هەر لەبەرەخۆی پرتەو بۆرەی بوو، کەس نەدەوێرا هەناسەی بدا، کاتەک برایەکەم دەرکەی کردەوەو لەگەر بابم منگەمنگەکیان کرد بابم تفەنگەکەی بردە سەربانێ و کردیە تەقەو رێژنەی گوللە ! سەر دیبەگەی

سۆر دەچۆوە!، هەتا گولەی لەتفەنگێ ما، تەققەی کرد، لەجیرانەکانمان گێم لێ دەبوو دەیانگوت: ئەوە کوڕێ مام سمایل کەرشینی بەزاوا بووە».

هەندەی پێ نەچوو هاجەرەی خوشکیشم داخوازی هات، بابم جوابی لۆ ناردنەوەو پێی گۆتبوون ئەمە بەخزمایەتیتان رازین، بەرام کەهاتن لۆ مارەکردنێ حەزمان لە قەرەبارغی و شایی و بەزم و رەزمان نیە لەپێش مارێ، دەمانەوێ بەکرو بێدەنگی ئیشەکە ببڕێتەوە، وەکی چوونەوە لۆخۆتان لەماری خۆتان کەیفی خۆتانە».

هاجەرەی خوشکم لەشەوەکی تاریک بەکرو بێدەنگی مارە کرا، بابم لێنەگەڕا دەستەخوشک وکیژی جیرانەکانیشمان شەوی مارەکردنی لەکنی بن لۆ پیرۆزبایی».

هاجەرە مارەکراو دەبایە لەژۆرێ نێتەدەرێ، عادەت ئەوهابوو! کیژ مارەبکرابایە دەبایە کەس نەیبینی هەتا دەگۆزرێتەوە، وەکی نان حازردەبوو هەموومان دادەنیشتین، ئەو خۆی دەشاردەوە لەژۆرێ، دەبایە بابم نەیبینی، چەند غەریبیمان دەکرد، بەرام عادەت ئەوهابوو».

ئێوارەی پێنج شەمیش بابم بەناوی قەسابی و کەسابەت رۆیشت و بەبرایە گەورەکەمیشی گۆت لۆخۆت برۆماری خارت، ئەومارە سبەی هاجەرەی دەگۆزنەوە لەمارێ مەبە، رۆژی جوعمەش داکم جلکەکی رەشی سادەی لەبەرکردبوو».

تیپە باسی هاجەرەو هەموو هاجەرەکانی کەندێناوەی بۆشکۆ دەکرد، ئەو هاجەرانەی پەپوولەی چارەنووسیان لەشەوانی کرۆبێدەنگیدا بە ناشارەزایی لێ هەڵدەفڕاندن، نەمانگەشەو نەئەستێرە نەباغ نەباران، هیچیان نەبوو!، شەوێکی رەهای لەخۆیان رەشتر، شەوێک چراش بۆی نادۆزرێتەوە، شەوێک لەتاریکایی خۆی زیاتر کەسیان نەبوو، شەوێک تاریکاییان پێشکەش دەکردن، تاریکاییان بۆ دەکردن بەبیرەوەری، تاریکاییان بۆن دەکرد، تاریکاییان بۆ دەکرنە باغ».

تیپە تـەنیا غـەریبی هاجـەرەی نـەدەکرد، بەڵکوشـەرمەزار بـوو لـەو نەریتەی رژاوەتە نوتفیان، خۆی بەشەرمەزار دەزانی کەنەیتوانیوە لەشەوی مـارەبڕینی پـاکترین فریشتەی کەنـدێناوە نێوچـەوانی مـاچ بکـاو پیرۆزبـایی ژیانێکی نوێی لێ بکات، دەستەکانی پڕبکا لەخەنەی سوورو شیرینی بەسـەر گەڕەک و ئاوایی دابەش بکا، لەمەراسیمی هاوسـەرگیریەکەی جلێکی جوان لەبەربکاو تێرتێر شایی و سەما بکا. نەهامەتیەکانی ژن و کۆنە نەریتەکانی زوڵمەت، دڵۆپ دڵۆپ فرمێسکەکانی تیپەیان بەردەدایەوە سەر روومەت..

ئێـوارە، ناچـاری کـردن خۆیـان کۆکەنـەوەو مشـووری ڕێگایـەکی هـەورازو نشـێوی دووربخـۆن، لـە ملـە زوورگـەکانی زەرگەتـە دەسـت پـێ بکەنەوە تا بەستی شـەرغە، زورگـەکان ئەوەندەچڕو پڕ کون و کەلەبـەرن، پێیـان دەڵـێن لوولـە، هێـدی هێـدی لەمـەڕدارەکانی ئـەوێ نزیـک بوونـەوە کەبۆشـەوبەکێو مابوونـەوە، ئاژەڵـدارو مـەڕدارەکان دووای تـەواوبوونی وەرزی زسـتان و دەرکـەوتنی بـەهارو تـا سـەرەتایی هـاوینیش لەشـەوبەکێو دەمێننەوە، چونکە هەموو ئـەو گیایانـەی کەشـین دەبن گەلـەک بەسـوودە بۆ ئــاژەڵ و هیچیشــی تێنــاچێ و چەنــد مانگێــک پاشــەکەوتی ئــالیکی مەڕوماڵاتـەکانیان بـۆ دەمێنێتـەوە، بـەهاری کوردسـتانیش تاچـاو بڕدەکـا گژوگیـاو فەرشـی راخـراوی سـەوزە لەسـەر زەوی، بۆیـە شـوانەکان مەڕوماڵاتـەکانیان لـەبنارو زوورگـەکان دەهێڵنـەوەو شـەوانیش هـەوارێکی گەرمۆکـە بۆخۆیـان رێـک دەخـەن و رەشـماڵێکی وەک گلێنـە چـاوی کیـژە کوردێکیش هەڵدەدەن..

شکۆو تیپەش سڵاو و ماندیبونیان لەهـەوارو بنەگەیـەکی ئـەوێ کردو نان و جامۆکە شیرێکی بەتامیشـیان خـواردەوە، هەندۆکەکیشـیان بۆ رێگـەی دوورو هات و نەهاتی خۆیان برد، کاروان و هـەنگاوی تولـەڕێگاکان دەستی پێکـردەوە، جارجـار رێچکـەکان بـزر دەبـوون و دەردەکەوتنـەوە، تاریکـایی دەیلوراند، شکۆ دەیویست بپرسێ و (با) پرسیارەکانی پێ دەبڕین، ئەوان

بەدیار چۆکدادانی چیاوە سەردەکەوتن، ترس سەیری دەکردن و دەتۆقی، سەری سورِدەما لەکورِانی قەرەچووغ و کەندێناوە، (با) گفقەی دەهات و دەیناسینەوە: ئەوانە بێ وڵاتن، لەسیماو هەنگاو و چاوە هەڵۆیینەکانیانەوە دیارن، ئەوانە هاورِێی باو زریان و هەورەتریشقەن.

(با) دەیزانی ئەوانەی بەوشەوە تاریکەوە رووناکی دەبینن کێن!، هەرزووش تەلان و زوورگە چرِەکانی دەشتی کۆیە و چیاکانی باواجی لەنێو تاریکی و لوورەی بادا کورِانی نیشتمانی خۆی ناسینەوە، چیا رووتەکەی (بنەباو) سنگ و هەناوی خۆی بۆ کردنەوە، ئەوشەوەش خۆی دایە دەست ئیرادەی کاروان و راگوزەران، گابەردێکی سنگ قلیشاو، هێشتا کۆنە قەوانی سەدساڵەی شۆرِشی تێدامابوو! جێگەی هەردووکیانی کردەوە، خەو هیلاکی کردبوون، چیا بوویەوە بەرِایەخ و بەرد بەسەرین و ئاسمان پێخەف، لەبەرهیلاکی وخەو برسیەتی نووقفەی لێوە برِابوو، باڵندەکانی بیرەوەریش نەیاندەتوانی لەشەقەی باڵیان بدەن و بگەرِێنەوە کەندێناوەو پرێسکەی یادێک بکەنەوە، غەمێک سەراوگێرِ بکەن و کۆژانێک لەگەڵ خۆیانا بێننەوە.

رێگایەکی سەخت و دژواریان دەستپێکردەوە، لەهەر گوندێک پارچە نانێک و قومێ ئاو، کاروانی ئەوان بە دۆڵی سماقوڵی و چیایی ئاوەگردیشدا تێپەرِی، کەشکۆ ماندوو دەبوو، تیپە باسی خەونی گەورەو دێرینی کوردی بۆدەکرد، باسی زامی نیشتمان و خوێنی شەهیدی بۆدەکرد، باسی ئەو ئامانجەی بۆدەکرد کە دوورونزیک هەردێ.

شەوێک هێشتا خۆی نەپێچابۆوە، هێشتا ئەستێرەکان لەجریوە نەکەوتبوون و پەپوولە دەستی بەسەمای سەرگوڵەکان نەکردبۆوە، تیپە پەنجەی بۆ رووناکاییەک درێژ کردوگووتی: ئەوە حەسارو بنەگەی برایمی شابازیە، پیاوەکی خانەدان و دیوەخاندارە، ئەو گوندە ناوی سناوەیەو ئەلعان ئەوانە بەتەنێ لەوێنە، هەمووجارێ لەوێ لامدایەو دووسێ رۆژانیش

لەکنیان مایمەوە، مارەکی دەست و چاوتێرو درگەورەن، وەکی مێوانیان دی خەنی دەبن، سبیانان ماست و پەنیرو لۆر، نێوڕانان چەلاوەکی بەتامیمان دەدەنێ، ئەوانە مەڕدارن، ئەوپیاوە دووژنی هەیەو چارپێنج کوڕی بەژنەو هەشن نۆ کیژو کوڕیشی مایە، هەمووشیان پێکەوە لەوحەسارەی دەژین، لەمریشکی هەتا چێروگای هەمووی بەخێودەکەن، لەومارەی کەس بێ ئیش وکارنیە..

بەیانیان گەیشتنە حەسارە گەورەکەی برایمی شابازی، هێشتا مابوو بگەن، سەگە سەرگەورەکانی حەسار بەکۆمەر هێرشیان هێنا، تیپە لەدوورەوە هاواری کرد: مام برایم خۆمانین، بمانگەیێ ئەو سەیانەمان لەکۆرکەوە..

مام برایم پیاوێکی بەتەمەن بەڵام هێشتا توندوتۆڵ، سەر سپی وەک بەفر، باریک و درێژ، کورتەکەکەی بەسەر شەرواڵەکەی شۆڕببوونەوە بەهەشتاوی هات و لەسەگەکانی خوڕیەوەو بەپیریانەوە هات و هێشتا نەگەیشتبونە یەکترگوتی: هەر زوو زانین تیپۆیە، هێشتا لەدوور بوون گوتن بەهەقێ خوای ئەو رۆینە رۆینێ تیپۆیە، هەمووجاریش هەرئەو وەختەی ئەهاتن..

تیپەی ماچ کردوو گووتی: ما هێشتا خۆ مەعف نەکردینە ؟ ئەدی کا (هەورۆ) ؟.

تیپە: هەورۆ لەهەولێرێیە، لەمارێ پلکی..

خەو لەنوێنی گەرم لەدووای ئەو کاروانە دوورە، لەمردنێکی کاتی دەچوو، نە بۆڕەبۆڕی چێرو نە باعەی مەرو نەقوقەی کەرەبابیش رێیان لەخەوی قوڵی شکۆو تیپە نەگرت، نیوەڕۆ هێشتا خەو یەخەی بەرنەدابوون، بۆنی چەلاوی مریشکە خۆمانە و برنجی کوردی دیوەخانی پڕکردبوو، دیاربوو هەمووان تیپەیان دەناسی، ئەوەندە لەوێ ماندووی حەساندبۆوە..

کوڕەکانی برایمی شابازی لەدیوەخانێ و ژن و بووک و کچەکانیشی لەژوورێکی تر نانیان دەخوارد، کەئێوارە دادەهات هەموو دەگەڕانەوەو دەرگای حەسارو هۆری مەڕی دادەخراو سەگە مل بەزنجیرەکانیش بەڕەڵا دەکران، کەئێوارە دادەهات وەک رۆژی حەشربوو، هەمووان دەگەڕانەوە جێگەی خۆیان، هەسپ حیلەی دەهات، چێر بۆڕەبۆڕی بوو، قرقرەی مەڕوبزن تێکەلی باعەباعی کاروبەرخان دەبوو، قازدەیقیڕاندو مریشک و کەرەباب لێی پەست دەبون، عەلەشیش دەچوونە سەر ناوبرەو کاریتەکان، کۆتر بوغەبووغیان بوو، شووشەی لامپاو فانۆسەکان بەدەست کچانەوە خاوێن دەکرانەوەو چراکان پرنەفت دەکرانەوە، هێدی هێدی تادەهات دونیا تاریکتردەبوو و دەنگەکان کەمتر دەبوونەوە، ئەو شەوە تیپەو شکۆ بەدیار چراو فانۆسی دیوەخانی شابازی بوون و گوێیان قوڵاخ بوو بۆ رادیۆنەکەی دەستی شابازی، کەجارجار بەپەنجە ووشک هەلاتووەکانی لەهەواڵێک دەگەڕا.

تیپە: مام برایم پێدەچی لەخەبەرەکی بگەڕێی ! باش هەستێ خۆت لێ راگرتیە!.

مام برایم دووسێ جار چاوەکانی داخستن و کردیەوە: کوڕم ترسن لەڕەو هەنە، لەڕەشەباو گەردەلولان، هەنگۆ نزانن پیلانی وان چنە؟ پازدەسارەک پێش هەنکە، کورد لەئەلعان بەهێزتربوو، ئێک شۆڕش و ئێک سەرکردەن هەبوو، داروبەردێ شاخان پێشمەرگەبوون، چۆکانیان لەبەرتۆپ و تەیاران دانەدەدا، خۆ چ چەکێ باشیش نەبوون ! بەرام ئیرادە هەبوون، دەبابان خۆیان لەبەر جامبێزاران نەئەگرتن، وەلێ داخێ گران خیانەت لەشۆڕشێ کوردا کران و شۆڕشێ کوردانێ فرۆتن، پەنجە لەسەر پەلاپیکێ تفەنگان هەرگیران، شۆڕش وەکێ بەفرێ شاخان توانەوە، هەموو ماروحارێ خۆ بەجێهێشت، لەغەریبیێ بێکەس ماین، ما گەلەک ترسن هەنە خەنجەرمان لەپشتێ راکەن.

تیپە: مام برایم ئەو هەوارە بەرام ئەو بوارنیە، کوردستان ئازاد دەکەینەوە ئەوجا دێمەوەو دەبمەوە مێوانت ئەوقسانەشت بەبیردێنمەوە».

شابازی بەخەنەدەیەکەوە: دیارە ئەتوو بەتەمای بمێنی ؟ وارێم بەکەلامیَ خوای ئەتوو لەزیادان دەژی، پیاویَ مەردوئازا عەمرییان درێژ نابن، لۆخۆ پیاویَ چاک بە هەولێران تەرک کە، شتەکن لەچاویَ دانە، لۆخۆ لێرە لەگەر شۆڕشان تفەنگیَ خۆ لەشان بیَ».

تیپە بەخەندەیەکەوە: هەتا والی نەکوژم هەولێریَ چۆل ناکەم.

شابازی: کوڕم ئەوپارووە وەتوو ناخورێن، خینێت گەرمەو خۆت وەهیلاکەتان دەدەی.

ئەوشەوە تا درەنگ بەدیار چرای دیوەخان و شەوچەرای گوێزەوە قسەخۆشەکانی شابازیەوە نەخەوتن، بەیانی زوو لەگەڵ تەپەتەپی نان پێوەدانی دەستی کابانیَ و قریوەی بێری و باعەباعی ئاوازی مەڕو زەنگوڵ و بانگی سەردیوارێی کەرەبابی خەبەریان بۆوە، ناندینەکەی حەساریَ دووکەڵی بەرزدەبوونەوەو بۆنی هێلکەو روون و ماست و ئەستوورکی گەرم دیوەخانی راگێڕابوو، دووای نان خواردن دەبوو کاروانی تیپەو شکۆ دەست پیَ بکەنەوە،

دیاربوو جارانی پێشوو هەمووجاریَ تیپە هەسپەکەی شابازی لەگەرخۆی بردبوو، بۆیە شابازی کوڕەکەی راسپارد خێرا هەسپە (رەخشان) یَ حازرکەن لۆ تیپەی، هەندەی نەبرد کوڕەکەی شابازی هاتەوەو جلەوی هەسپێکی شێی سیَ پیَ سپی، سەربڵندی گویَ قوتی، بژ رەشی کلک بڵندی چاو زەقی کەپوو فشی بەدەستەوەبووا، دەیحیلاندو لەحەساریَ دەنگی دەداوەا، پێدەچوو تیپە پێشتر زۆری قۆشمەقۆشم پیَ کردبوو، خێرا خۆی فڕێدایە سەرپشتی و دەستی شکۆی راکێشاو هەردووک سواری سەرپشتی بوون، برایمی شابازی پەنجەی بۆ چیا بەرزوعاسێکەی هەوریَ راگرت و گووتی: تیپە وەکی جاران لەسەریَ چیایێ

شـۆڕبوونەوە، لـەدیوێ ئـەودیوی جلـەوان لەپشـتێی گرێدەنـەوەو شـەپێکی لەپشتێی دەن وەخۆی دێنەوە ئێرە.

تیپە: بێ خەم بە مام بریم.

لەســەر پشــتی هەســپە رەخشــانێ لــەچیا بــەرزەکانی هــەورێش بەسەرکەوتن، توولـە ڕێگایـەکی سـەخت و دژوار ئەگـەر ڕەخشـان نەبووایـە ئاســان نــەبوو، چیــایی هــەورێش چــۆکی داداو بالیســانی ڕاکشــاویش بەدەرکەوت و رەخشانیش گەڕایەوە، تیپەو شکۆ بوونە میوانی (توتمێ)، گوندێکی قایم و پشتی بەسەرباری خـەتێ دابوو، لـەوێ شۆڕشـی ئـازادیی سەرلەنوێ نەشـونمای دەکردەوە، لەدووای هـەرەس و نسکۆی گـەورەترین شـۆڕش، دووبـارە جـاڕی خـەبات دادەڕێژرایـەوە، بارەگاکـان دوورو نزیـک لەڕیزیەک، بەبناری شـاخەوە بـوون، خانووەکانیـان لەبـەردو رەنگـی چیاکـان هــەڵچنیبوو، هەربارەگایــەک تایبــەت بــوو بەناوچەیــەکی داگیرکــراو، تیپــەو شـکۆش میـوانی بارەگـای کەنـدێناوەبوون، چەنـد ژوورێکـی سـەربەکاریتەی درێـژی لەڕیزیـەکتر، هـەر ژوورەو کـاری تایبـەتی خـۆی هـەبوو، ژووری بەرپرسـی یەکـەم و ژووری ئامـارو عـەمباری چـەک و پەیوەنـدی و پـلان و هەتا پزیشکیش ژووری تایبەتی خۆی هەبوو، ژوورێکی گـەورەش کەتایبـەت بـوو بەپێشـمەرگەی شـەڕکەر، دەرگـایی ژوورەکـان لەچەنـد پارچـەدارێک درووسـت کرابـوو کەبـەبزمار لەیـەک درابـوون، هـەر ژوورەو چەنـد کۆنـە رایـەخێکی تێدابوو، تیپـە وەک شـارەزایەک لـەژووری بەرپرسـی بارەگاکـە چــووە ژوورێ وهەنــدەی نــەبرد بــەدوای شکۆشــدا هاتــەوەو ئەویشــی بردەژووری.

بەرپرســی بارەگاکــە گــەنجێکی رەشــتارەی پێکــەیی و ســیمایی ماندووبوونی چیـای پێوەدیـاربوو، کـورکن و دژوون، بـەلام پـڕ هێزوتوانـا، کورتـەک و شـەرواڵێکی خـاکی و پشـدێنێکی توونـد کـەبێ هەناویەکـەی بـزر کردبوو! بەدەنگێکی نەرم رووی لەشکۆ کرد: تیپە باسـی تـووی لـۆ کردیمـە،

بەخۆشم بابت دەناسم جوتیارێکی کەندێناوەیە، بەخۆشت دەزانی کەندێناوە زیاتر لەشوێنەکاتی دی تووشی گرفت و تاران و دەربەدەری بووە، ئەلعان کوردستان هەمووی داگیرکراوەو ئەوان بەئاگرو ئاسن حوکمی کوردستان دەکەن، بەرام لەهەموو دونیا سەردەمی داگیرکاری بەسەرچووە، هەموو گەلانی دونیا بەئازادی دەژین و بەخۆیان حوکمی خۆیان دەکەن، تەنها نەتەوەی کوردماوە !، لۆیەکە دڵنیامە دەبی ئەودۆخە بگۆڕێ، دەبی وەهایان لێ بکەین کەبزانن خاک و ولاتی خەڵکی تریان داگیرکردەوە و بۆیان ناچیتەسەری، هەزار پیلانی دیشمان لی بکەن بێ فایدەیە، دەبی بگەڕێنەوە ولاتی خۆیان، کورد پیاوکوژنیە، چەتەو چەک هەڵگرو ریگرنیە، بەرکو ناچار کرایە شان بداتە شاخەکان و داکۆکی لەخۆی بکا، ئەمە نەدوژمنی کەسین و نە دەشمانەوێ تەققە لەکەس بکەین، بەپێچەوانەوە دەمانەوێ پەیوەنی باشیشمان لەگەریان هەبی، بەرام ئەوان بەزۆر کوردستانیان بەولاتی خۆیان لکاندیە، خێروبێری ولاتیمەش دەبەن و لەشکری خۆیان پێ بەهێزدەکەن و چەکی پێ دەکڕن و پێ دەمانکوژن، ئەوان دەیانەوێ بەخۆیان ئاغە بن و کوردیش خزمەتکاریان بی، خۆ هەموو شۆڕشەکانی رابردووی کورد ویستیتیان لەڕیگەی گفتوگۆوە قەناعەتیان پێ بینن و یەقەمان بەردەن، بەرام هەربەئاگرو ئاسن و خەنجەر لەپشتەوە لیدان وەلام دراینەوە، لۆیەش ئەوەی ئیستا ئەمەی لێرە کۆکردیتەوە و ئەوشاخانەی کردیتە ماروحارمان، ئەوە ویست و حەزی خۆمان نیە، بەرکو تاکە ریگایە تا زمان و کلتوورو شارستانیەتی خۆمانی پێ بپارێزین، بەرام تاسەرئیسقان دڵنیاین کە تاکە ریگایی سەربەخۆیی بەداخەوە چەکە، ، ئەمن گەلەک خۆشحال بووم بەهاتنت، دڵنیام رۆژەک دادێ دەگەڕییەوە کەندێناوەی و بەئازادی لەگوندەکەی خۆتان بەئاسوودەیی دەژی، بەرام ئەمن پێم باشە نەگەڕێنەوە هەولێرێ، زانیاریمان هەیە گەلەک بەهوردوباریکی لەدوو ئاشکراکردنی تیپەن، زۆریان کۆر لێیە، بەرام ئەگەر هەردەشگەڕێنەوە دەبی

هەتا بەخۆمان پێتان دەرێین هیچ جولەجولەکی نەکەن، بەهیچ شێوەیەک دەست لۆتفەنگی نەبەن، بڕۆن خەریکی ئیشی کرێکاری خۆتان بن، پێم وایە گۆڕانکاری گەورە روودەدەن و دۆخەکە دەگۆڕێ، رەنگە ئەوکات زیاترلەئێستا پێویست دەبن».

کەتیشکی شەبەنگی زەردەپەڕێکی درەنگ وەختی ئێوارە لەکاریتەی هەیوانی بارەگاکانی تووتمێی دەدا، لەگوندە خاکیەکانی کەندێناوە دەچوون کە شانیان دابووە قەرەچووغ و بارگەو پرێسکەیان لەبناران خستبوو، باڵندەی یادەوەریەکانی شکۆ بەرزبەرز ئەوێیان لێ دیاربوو، کەئێواران سابیری باوک بەرەو مزگەوتە خشت و قوڕینەکە دەچوو، سافیەیی گەورەترین قوتابخانەو قوربانیش دەهات و دەچوو و خەمی نانی ئێوارەی لەبەربوو، کەچرا دڵگەشەکەی تووتمێ هەڵکرا، پارچە پەڕۆکەکەی دەستی خوشکە خێرنەدیوەکەی هاتەوەبیر، کەشووشەی لامپاکەی پێ خاوێن دەکردنەوە لەدووکەڵی دوێنێ شەو».

باڵندەکان بێ ئەوەی هەڵەتەبن، خێرا بەکۆڵێ یادەوە دەگەڕانەوە نێو هەناسەکانی شکۆ، کانی وجۆگەلە نەفامەکەی تووتمێ کە بەبەختەوەری شۆڕدەبوونەوەو ئاوڕیان نەدەداوە، لەهەمان کانی دەچوو، کەسافیە جۆگەلەیەکی راکێشابووە باغچەکەی، شکۆ لەنێوانی ئەوێ و کەندێناوە، بەتەرازووی غەم (با) و کانی و بنارو چراو مانگ و خۆڵەمێشی گوڵەکانیشی دەکێشا، هەموو شتێک بۆنی خەمو مەرگ و جێ پەنجەی سافیەو خوشکەکانی پێوەبوو، شەو تێپەڕی و چەند رۆژێکی کورت هاتن وچوون، نیوەڕۆیەک هەواڵی بەپەلەهات، خێرا هێزێک کۆکەنەوە، هەربارەگایەک بیست پێشمەرگەی ئامادەکراوی بەڕێکەوێت، تیپە یەکێک بوو لەبیستەکان، شکۆ ئۆقرەی لێ بڕابوو، داواکەی رەتدەکرایەوە، دیاربوو چەندجارێک پێداگری کردو ناچار جێگەی بۆ کراوە، هەمووان رێکخران و

کەموکوڕیــەکانیان پڕکرایــەوە، هێشــتا بــەڕوونی کەســێک لەمەســەلەکە نەدەگەیشت، بەلام پێشبینی شەڕێکی گەورە دەکرا.

دەڵێن دوژمن هێزێکی گەورەی کۆکردۆتەوەو نیازی هەیە هێرش بکا، نانــا دەڵــێن پــەپێی بەرنامەیــەک ئێمــە هێــرش دەکەینــە ســەریان، خێــرا مــەتارەکانتان پڕئــاو کــەن، نــان و قەســپ و پیــاز دابــەش دەکــرێ، دووبــارە هێزەکــان کرانــەوە دووبــەش، بەشــێک لای چــەپ و بەشــێک لای راســت، بەهیوای دیدار، بەرەو خۆرئاوا.

هەموو پەلەیان بوو، خێراتر لەبەرپرسەکانیان بۆ نووسینی داستانێک کەنەدەنووســرایەوە، داســتانێک کەخــەو لەداگیرکــەر تــاڵ بکــا، لــەو ئێــوارە هــەڵکوڕماوەدا هــەنگاو لەســەربەردەکان دەخلیســکان و داســتانێک پەلکێشــی دەکــردن، دەنگی جیهازێــک دەهــات و دەیگــووت ئێمــە لــەناو گونــدی (دەڕش وشــاچک ) یــن چیاکەشــمان بەدەســتەوەیە، دوژمــن هێزێکــی زۆری کۆکردۆتەوەو دەیانەوێ هێرش بکەن.

وەلام دەدرایەوەو دەیگووت: ئێمەش لەڕێگەین دەست پێشــخەر مــەبن تادەگەینەلاتان، شەو تەواو راکشابوو هێشتا بەدەم زیندەخەونی سپێدەیەکی روون دەبــۆرژان و گەیشــتنە یــەک، ســەگەکان بــەدەم بــۆنی رووداوێکــی ســەختەوە لــەوەڕین نەدەکــەوتن، گەیشــتنە نێــو چــەقی شــەقی رقــی پیــرۆزی خــاوەن وڵات و ئــاگری گــەرمی داگیرکــەران، شەڕدەســتی پێکــردو دوژمــن بەلەخۆبایی بوونــەوە هێرشــی زەبــەلاحی دەست پیکردو دەبابــەکانیان غلــۆر دەبوونەوە، ڕێژنە گوللە یەکی بیکەیسی ئاسمانی رەشــی شــەق کردو لەگــەڵ گری یەکەم ئارپیچیدا دەبابەکان قوچاندیان، شەڕ وەک گەواڵەیەکی داکردوو گــەرم بــوو، گرمــەی تــۆپ عــەردی دەهەژانــد و پێشــمەرگەی ســووردەکرد لەخوێن، هاوڕێکەشی هاواری دەکرد ئیزنیان نەدەن، لێ نەگــەڕێن دەربازیــان بــێ، رێــی گەڕانــەوەیان لــی بگــرن، چیــا نابێتــە بیابــان، لێــرە هەربــەردێک پیشــمەرگەیەکە، تاریکــایی دەیلورانــدو تــەنها گوللــە گڕدارەکــان لەیــەکتری

تێپەڕدەبوون، شەریخەی ریژنەی تفەنگ و لوولەی بەئاگری چەکەکان تادەهات لەیەکتر نزیک دەبوونەوە، کاتێک مانگ لەپەنایی هەور دەردەکەوت، داگیرکەرە کلاو سوورەکان خۆیان دابووە پەنا ئەوبەردانەی کە گوللەی پێشمەرگەی لێ هەڵدەقۆزینەوە، یەکێک زمانی ئەوانی دەزانی و هاواری دەکرد: خۆتان بدەن بەدەستەوە، ترس سەیری دەکردن و دەتۆقی، (با) لەگیڤە گیڤ کەوتبوو !، کوڕانی عاشق و مەست بەنیشتمان بەبرینداری دەیانگوت لێرە بمانێژن، رەنگە رۆژێک ئەو شاخە سووربەخوێنە بەوداستانە بناسرێتەوە، لێرە بمانێژن رەنگە رۆژێک کچان و کوڕانی ئەو نیشتمانە لەسەر مەزاری نەبەردی براکانیان سروود بڵێنەوە، رەنگە رۆژێک بەردە سوورەکانی ئێرە بکەن بەچیرۆک، لێرە بمانێژن لێرە، رەنگە سبەی ئێرە ببێتە هەواری رازوخوازی کچان و کوڕانی کوردان..

کە مانگ لەژێر پەرچەمی هەوری نیوەشەو چاوی گەشی دەکردەوە لەسەر تاتە بەردان خوێنی رژاوی کوردی دەبینی، کە (با) دەهات بۆنی خوێن و بۆن کرۆزی خاکی دەکرد، کە کۆتری رۆحەکان بەیەکجاری هەڵدەفڕین و بەتەنیشت مانگەوە تێدەپەڕین، مانگ خۆری پێ نیشان دەدان و پێی دەگوتن سبەی خۆرێکی نوێ هەڵدێ، سبەی لەجێی هەنگاوەکانی ئێوە درەختێک سەوزدەبێت و هەموو باڵندەکانی ئێرە سروودی بۆدەڵێنەوە، سبەی لەجێی خوێنی رژاوی ئێوە کانیەک دەتەقێ و باڵندەکان بەدەوریدا دەستی یەک دەگرن و چاو لەماسیەکان دادەگرن، سبەی کۆچەریەکان بێرەدادێن و تەدارەکیان لێرە دەخەن، شەو لەوبنارە دەمێننەوەو منیش چیرۆکی مەرگی بەپێوەی ئێوەیان بۆ دەگێڕمەوە..

لەپڕ لەنێوانی شریخەی تفەنگەکان دەنگێک بەهێزەوە: کەس بەپێوە شەڕنەکا، خۆتان بپارێزن، دەست بەفیشەکەکانتانەوە بگرن، دوژمن شکاوە، هێدی هێدی دەنگی تەقەقە کەمتر دەبۆوە، بریندارەکان دەگوازرانەوە دواوە، تا دەهات دونیا رووناکتر دەبوو، تیشکی زیوینی بەیانی دەستی لەئامێزی

پێشمەرگە بریندارەکان بەرنەدەبوو، سەربازە کڵاوسوورەکان کەسیان بەپێوە نەمابوون و ئەوانەی مابوونەوەش تاریکی داڵدەی دابوون وگەڕانەوە.

نێوانی گابەرد و شاخە سنگ قلیشاوەکان پڕبووبوو لەتەرمی سەربازە کڵاوسوورەکانی دوژمن، چەکە تازەو نوێیەکانیان بەجێمابوو، ئەو داستانە لەناکاوە زیاتر چاوەکانی شکۆی بەدونیای بوێریدا کردەوەو وەک ئاوازی رووبارێک ببوو بەلاوکی سووتان، بۆیە لەقەدەری لەناکاوتردەگەڕاو بیری لەکاروانی مەحاڵتر دەکردەوە، هەنگاوەکان زیاتربەپێشی دەکەوتن و دەیویست دڕکەزی ترس بتۆقێنی، بۆیە بەنیازبوو نەگەڕێتەوە هەولێرو چیدی سڵاو لەقەڵا نەکاتەوە، جارجاریش باڵندەکانی غوربەت پیاسەیەکیان بەسەرقەلاو شێخەللاو تەزبێح فرۆشەکاندا دەکردو مام برهان بەدەستە شەقبووەکانی دەرگای کارگەکەی لێ دەکردنەوەو تەباخەکەی گەرم دەکردوهۆڵەکەی پڕدەکرد لەچایەکی ناوەختانە، ئێوارەیەک بەدیار چراکزەکانی تووتمێ بڕیاری سەفەری گەڕانەوەی تیپەو شکۆ درا.

+ ئێوە دەبێ بگەڕێنەوە هەولێرو بچنەوە سەر کارەکەی خۆتان، بێ ئەوەی هیچ جولەو خۆدەرخستنێکتان هەبێ، تەنانەت ئەگەر دەرفەتیشتان بۆ رەخسا، تائێمە ئاگادارتان دەکەینەوە هیچ چالاکیەک ناکەن.

تیپە: ئەخر کوشتنی والی رەنگە دەرفەتەک بی و هەمووجارێ نەڕەخسێ.

+ کاکەتیپە گورز وەشاندن لەوالی ئیشەکی ئاسان نیە، ئێمە پیشتر لەوبابەتە ورد بووینەوەو هەوڵمان داوەو باجیشمان داوە، پێمان باشە ئەوبابەتە جارێ دابخەین، کەکاتی هات خۆمان ئاگادارت دەکەینەوەو پێکەوە ئیشی لەسەردەکەین، بەڵام ئەوەی من ئاگادارم ئێستا مەحاڵەو تەنها رژانی خوێنی کوردە.

تیپە بەکزیەوە: باشە.

بەیانی سەفەر دەستی پێکردەوەو تیپەو شکۆ بەهێزتر لەجاران کەوتنەوە ڕێ، دەبوو چۆک بەچیای هەورێ دابنێن و بەهەمان ڕێگەی خۆیان بگەڕێنەوە، توتمێ و سەرباری خەتێ بەجێما، لەسەردڵیان شوێن پێی یادەوەریەکان نەخشابوو، هێشتا نان و تەڕەپیازەکانی باخەڵیان مابوو، گەیشتنەوە حەسارە گەورەکەی برایمی شابازی، شەوێکی تریش میوانی کت وپڕی دیوەخانەکەی بوونەوە، لەکاتی خواحافیزیشدا جگە لەتوورەگەیەک نان وخواردن، بووکەکانی شابازی (ملپێچ) ێکی سووری نەخشکراوی دروستکراوی دەستی خۆیانیان بەدیاری دایە تیپە، وێنەی خۆرێکی زەردی تێدا دروست کرابوو، کەسەرەتای هاوین مەڕ دەبڕێنەوەو خوریەکەی خاوێن دەکرێتەوەو بەتەشیان دەڕێسری و ڕەنگ دەکرێن و دەکرێنە گلۆرە بەن، ژنە داهێنەرو ئازاکانی کوردەواری ملپێچ و گۆرەوی و دەستەوانەو رایەخ و زۆر کەلوپەلی تریشی لێ دروست دەکەن.

تیپە ملپێچە سوورەکەی لەمل کردو ماڵئاواییان کرد، بەنێو دۆڵ و بنارو هەڵەتە سەختەکاندا توولە ڕێیان دەگرتن، شەو خەریکی ڕۆیشتن و ڕۆژیش ئیسرەحەت و خەو و خۆشاردنەوە، تادەهات هەولێر وەک مرواری جوانتر خۆی نیشاندەدا، وەک دایکێک باوەشی بەجۆشی بۆکوڕەکەی کردبێتەوە، بۆنی هەولێر لەبۆنی عەشقێک دەچو بەقەد بەرزی مانای ژیان، لەشیعرێکی باڵابەرزی چاوکاڵ دەچوو مەکیاژی لێوەکانی بەیەخەوشانی کوڕیکەوە مابێ، وەک خوناوی لێواری گوڵ بەتریفەی مانگ ئاشنابێ، هەولێر لەماڵێکی گەورە دەچوو، بۆئەوانەی بت خانەیان لێ رووخابێ، سنگی سەرینی غەریب و ئەو دەستەی نانی بڕابێ،

هەتوانی ئەو برینەبوو عەشقی پاکی لێ کوژرابێ،

درەنگانی شەو ڕێگاسەختەکان تەواوبوون، دۆڵ ودەشت و چیاو لوتکەو تولە ڕێگاکان بوون بەیادو بیرەوەری شەوان، کۆڵانەکانی

هــەولێرکش ومــات بــوون و روونــاکی بــەر دەرگاکانیشــیان بەبێداری کـز دەســـووتان، خۆزگـــەکانی ئەوشـــارە لەخـــەوێکی قوڵـــدابوون، گەیشـــتنەوە ئەوکۆلانەی کەتیپە لاولاوەی خەونەکانی پێوە هەڵچنیبوو.

تیپە سەری بردە بن گوێی شکۆ و بەنەرمی: دەبی دەمانچەکەم لێرە بەجی بێلم، لەوتاریکاییە چاوەڕێم بە.

لەماڵەکــەی ئــەولاتری مــاڵی فەرزانــە، کەعەرەبانــەی شــێلمەکەی لــێ راگیرابوو نزیک بۆوە، لەگەڵ ماڵی فەرزانە تەنها گۆڕەپانێک لەنێوانیان بوو، کۆنـە خـانوێکی لەکـەرپوچ درووست کـراو، حەوشـەیەکی درێژ، دەرگایـەکی ئاسن جۆگەلەی حەوشەی بەبندا هـاتبوو، گڵۆپێکی کزی لـەپێش هـەڵکرابوو، تیپە لەسەر دیوارەکە سەری هەڵکێشاو کـەمێک بێدەنگ بوو، ئاودیوو بوو وهەنـدەی نـەبرد بەبێدەنگی دەرگـای حەوشـەکە کرایـەوەو ژنێکی بەتەمـەنی کەڵەگــەتی رەشپۆشــی ســەربەهەوری و جلوبــەرگی کــوردەواری، دەســت بەدەمانچەوە دەرگاکەی کردەوە.

ئەو ژنە (بەگم) بوو، بەگمێ حەمەخانێ.

حەمەخان لەچاردە بەهاری تەمەنیدا لەگوندەکەی خۆیان بـەهۆی مـاڵی ئاغاوە جێگەی لەق دەبێ و گەڕیدە دەبێ، لەکەنـدێناوە لەگوندی کۆزەپانکە دەگیرسێتەوەو لەوێ لای مەحموود ئاشەوان بەنان و زگ دەبێتە ئاشەوان.

ئاشـەکەی مەحموود تاکە ئاش بوو لەدەشتی پان و بـەرینی کەندێناوە، لــەوەرزی حاســلاتان کــەدەغڵودان دەدورایــەوە، تــا کۆتــایی پــایز بــەردەم ئاشــەکە جمەـــەی دەهــات، خــەڵک زەخیــرەی ســاڵەکی دادەکــرد، هــەموو گونـدەکانی کەنـدێناوە بەکـەروبار باراشـــی خۆیـان دەبـردو لێیـان دەکـرد، ئەوکات دەغڵودان ئەوەندە کەم بوو!، کەم کەس دەیتوانی لەپێداویستی خۆی زیاتر بەرهەم بێنی، دانەوێڵە بەدەست تۆدەکرا ! بـەداس و دەسـتێ سـەپانان دەدورایـەوەو ژنـانیش دەبوونـە گیشـەکەریان و لـەدواوە بەپاشـۆلان کۆیـان دەکــردەوە. هەرکــەس گــەنمێ خــۆی لــەجواران دەکردوبەپشــتێ کــەرێ

دەیانبردە ئاش و دەیانکردە ئارد، ئەو وەرزە بەردەم ئاشەکە ئەوەندە قەرەباڵغ دەبوو هەندێک جار دووشەو و دوو ڕۆژان دەمانەوە تا نۆرەیان دەهات، نان وهێلکەو تەرەپیازیان لەگەڵ خۆیان دەبردوئالیکی ولاخەکانیشیان لەبیرنەدەکرد، گۆڕەپانی بەردەم ئاشەکە ببووە سەکۆی یەکترناسینی زۆربەی گوندەکانی کەندێناوە، هەندێک جاریش خزمایەتی و ژن و ژن خوازیشی لێ دەکەوتەوە.

لەبەرئاژەڵداری و ئیش وکاری زۆر، هەندێک جار کوڕوباوک یان ژن ومێرد، یانیش باوک و کچ لەئاش دەمانەوە، زۆرجاریش ژن وپیاوی پیر گەورەکچێک یان بوکێکیان لەگەڵ خۆیان دەهێنا.

هەندێک ژن لەوئاشە چاویان لەکچی ئازاو زەریف دەگێڕاو دواتر بۆ کوڕەکانیان دەچوونە داخوازی، کچەکانیش لەوسەین وبەینەی ژنان گەیشتبوون و لەکاتی باراش خۆیان دەردەخست و گەنمیان دەخستە سەرملان و لەدۆرەدانەیان دەکرد.

بێجگە لەژن و ژن خوازیش، کڕین و فرۆشتنی پەرێزو مەڕو ماڵات و کاو تەنانەت مامەڵەی چەکیش دەکرا، هەندێکیش سەری خۆیان نەدەهێشاندو سەریان بەباراشەکەی خۆیان دەکرد تا نۆرەیان دەهات.

ئاشەکە کەمێک لەدەرەوەی گوندەکەبوو لەسەر بستێ، ساکەگۆڕێکی تەختایی لەبەردەم بوو، ژوورێکی درێژی سەربەکاریتەی شەقرەڕێژ، لەناوەندی ژوورەکە ناوبڕەیەکی تاپشدێنی بۆ کرابوو، لایەکیان مەکینەی گازەکەبوو و لایەکەی تری ئاشەکەبوو، قایشێکی پان بەیەکی بەستبوونەوە، سەرێکی قایشەکە بەمەکینەکەوەبوو دەیسوڕاند، سەرەکەی تری بەشەفتێکەوەبوو کەبەردی هاڕینی ئاشەکەی دەسوڕاند، مەکینەکە لەلای ڕاست بووگزۆزێکی درێژی پێوەبوو بەکونێکی قەد دیوارەکە چووبوە دەرێ و دوکەڵی لەکاتی ئیشکردن دوکەڵی لێ بەرز دەبوونەوە، ئەوانەی لەڕێگەی دوورەوە دەهاتن زوو دوکەڵی ئاشیان دەبینی، مەکینەکە لەسەر

چوارپێچکەی ئاسنی قورس داندرابوو، بەگازوایل ئیشی دەکرد، ساڵێ دووجار هەشت بەرمیل گازیان لەکەرکوک لەبۆ دەکڕی، لەلای چەپی ژوورەکەو ئەودیوی ناوبڕەکەش ئاشەکەبوو، لەسەرەوەی ئاشەکە عەمبارێکی ئاسن بوو پێیان دەگوت دۆرەدانە، گەنمەکەی تێدەکراو لەخوارەوە لەکونێکی باریکەوە گەنمەکە دەڕژایە نێوان بارداشەکەو دەبووە ئارد، لەبنەوەش تەشتێکی ئاسن بوو، ئاردەکەی دەهاتە ناوێ و گوشیان پێوەدەنا تا پڕدەبوو، بەدرێژایی شەو ئاشەکە تەپەتەپی نەدەبڕا، مەحموود ئاشەوان کوڕی نەبوو، دووکچی هەبوو بەگم و زارێ.

حەمەخان تازە هەڕەتی لاوی بوو، ئاشەوانێکی ئازاو زیرەک ولێزان و راستگۆبوو، دەست و داوێن پاک، خواردن و خەویشی هەرلەئاشەکەبوو، مەحموود ئاشەوانی بابێ بەگمی زۆری خۆشدەویست.

زستان خەریکی پێچانەوەی سەرماوسۆڵەی خۆی بوو، تازە پەڕەسێلکە دەبوونە میوانی قەمتەرەی ماڵەکانی کەندێناوە، دەشتی گەنم ونان، میوانی پاڵەو رەنج دەران، پیرەپیاوەکان هێشتا خەریکی حیساباتی زستان و بەهاربوون، جوامێرەکانیش لەخەمی هات و نەهاتی گەنم وجۆ، کوڕ لەخەمی دولبەرو کیژ لەخەمی گوارەو خەزێمان، کارو بەرخ هێشتا لەهۆران دەرنەکرابوون.

تاعوون کت وپڕ رقی بێ وێژدانانەی خۆی هەڵڕشت و دەستی رەشی گەیشتە هەموو ماڵێک، هەر زوو ماڵی ئاغا درکیان پێ کردوو بەخاو و خێزانەوە چوونە شار، تاعوونی رەش سەرەتا دەستی لەمناڵان نەپاراست ولەباوەشی گەرمی دایکیان دەریهێنان، مەملەکەتێک نەیاندەزانی ئەوئافاتە لەکوێوە دێ! هیچیان نەبوو جگە لەفرمێسک وهاواری خوا، تاعوون ئەوەندە دڵڕەق بوو، بەمنداڵێک رازی نەدەبوو، هەرچی هەبوو لەگەڵ رەشەبای رەشی خۆی دەیبرد، هێدی هێدی زیاتر رق و تووڕەیی دەباراند، پیروجوانی لەیەک جیانەدەکردەوە، سێبەرو کۆڵەگەی ماڵی دەڕووخاند، ژن دەمردو

منداڵی ساوایان لەباوەشی ساردوسڕی دەردەهێنا، ئافاتی رەش کەندێناوەی رادەگێڕا، ماڵ هەبوو بەیەکجاری دەرگای لەسەردادەخرا، ماڵ هەبوو ژن وپیاو دەست لەئەژنۆ تاقی منداڵیان لێ دەبڕا، نەیاندەزانی ئەمجارە تاعوون لەبەرقاپی کێ نۆبەدارە، ئەوانەشی تاعوون دەستی رەشی نەگەیشتبووە هەناویان، وشک و لاوازوهێزتیانەماو، رەق وەک دارەبازە، تاعوون نەیدەهێشت دەست بۆ پەلکێ نان ببەن، قومێ ئاویان بەهەستی ژەهر دەخواردەوە، توانای ناشتنی ئەوهەموو کۆچە بەکۆمەڵەیان نەبوو، هەندێک جارگریانیش هێزی زیاتری پێویست بوو، خواپێدراوترین مرۆڤ ئەوکەسەبوو بتوانێ مردووێیک لەدەمی سەگ بکاتەوەو بیخاتە ژێرگڵ.

مەڕومالات بەکۆمەڵ لەحەساروجۆمان مرداردەبوونەوە، سەگ لەکۆندرەکەی خۆی نووسکەی لەبەردەبڕا، مریشک وکەرەباب و پەڕەوەر لەکۆریتەکانیان دەبوونە خۆراکی کرم، هەرکەندو جۆمێک تەژی لەئاژەڵ و پەڕەندەو فڕندەی مردار، باڵندە لەهێلانەیان بۆئەبەد نووستبوون، چاوەڕێی ساقەسۆرەی هێلکەکانیان نەدەکرد.

ساڵ سوڕایەوەوهەواڵی رۆیشتنی تاعوون، کەسی دڵخۆش نەکرد، باران موژدەی ژیانەوەی پێدەدان و ئەسرینی چاوەکانی کەسی نەسڕینەوە، ماڵێک نەبوو تاعوون دەرگایی نەهەژاندبێ و ئازیزی لێ نەسەندبن.

باران ماچی دەکردن و سەبووری لەعەرشی خوداوە بۆ دەهێنان، دۆڵ و دەشت و بناری بۆ دەشووشتنەوەو لەپەنجەرەی هەموانی دەدا، کەس کەندێناوەی پێ نەدەزانی جگە لەباران، نامەی بۆ باڵندەکان دەنارد ئەمساڵ بێنەوە، مەملەکەتێک باران عەشقی ببوو و خەمی بۆدەخوارد، هەموو رۆژێ دەهات و سەری لێدەدان، هەموو دانەئێوارەیەک بۆنی ئاسمانی بۆدەهێنان، رەنگی مانگ و ئەستێرەی دەپرژاندەوە سیمایان.

باران دەستنوێژی بەخاک هەڵگرت و دۆل و دەشت و دەری شووشتەوە لەژەهری مەرگ، گیا سەرلەنوێ ناخی ئاخی شەق کردەوە. .

دەرگاکان بەبێتاقەتی دەکرانەوەو شەوان چراکان هەڵدەکرا، سبەینان دووکەڵی سەرناندینەکان باڵەفڕکەیان بوو و تەپپەی دەستی کابان دەهات نانی دەخستە سەر سێری گەرم، گاسنەکان بەبێ حەیران گەڕانەوەو دڵی زەوییان دەکێلایەوە، کۆتر دەهاتنەوەو هێلانەیان ڕێک دەخستەوە، منداڵێک دەیویست بێتە دونیاو ژانی خستبووە هەناوی دایکێک، تاعوون پیرێژنە مامانەکانیشی لێ بردبوون، هێدی هێدی گەنم هاتەوە عەمبارەکان و ئاشەکە دەرگایی کرایەوە..

تاعوون تەنها دووایین هەناسەکانی مەحموود ئاشەوانی بۆ بەگم هێشتبۆوە..

حەمەخان مەکینەی ئاشەکەی هەڵکردەوەو تەپەتەپی دۆل و دەشتی پڕ کردەوەو دووکەڵی گەیشتەوە ئاسمان، کاروان هێدی هێدی بەکزی دەهاتنەوەو باراشیان لەئاش دەخست..

مەحموود ئاشەوان کلیلی ئاشەکەی دایە حەمەخان و بەهەناسە سواریەوە پیی گووت: مەردێ خوای بە ئامانەتی تووبی بەگم..

یەکەمین بووکی رەشپۆشی دوای ئافاتی تاعوون (بەگم) بوو.. هەرزووش لەگەڵ حەمەخانی مێردی شانی دایە ئاشەکەو پێکەوە بەیانیان بەئیشیان دەخست و تا باراش بمابووایە نەیاندەکوژاندەوە، مەحموود ئاشەوانیش جارێکی تر زرمەی پێیەکانی نەهاتەوەو گۆچانی بەرنەدا تامرد..

حەمەخان بووە سەرداری بەگمێ.

مەحموود ئاشەوان لەبەرامبەر ئاشەکە لەوبەری کەندێ، حەسارێکی قایمی کردبوو، هەرچواردەورو دیواری بەخشتی مەشکانی برندکردبوو!، دەرگای حەوشە دەستکردی جولەکەکان بوو، لەداری پتەو و بەرزو بەبزماری گەورە درووست کرابوو، لەدەرگایی حەوشەوە تادەگەیشتیە خانووەکە هەندەی گێڕانەوەی چیرۆکێکی دەبرد!، خانووەکە بەخشتی مەشکانی درووستکرابوو، لەخوارەوە چوار ژووری گەورەو هەیوانێکی

درێژ، قاندرمەیەک بۆسەرەوەو لەوێش هەمان ژوورو هەیوان، کاریتەی سەر ژوورەکان وەک پەنجەی دەست ریزکرابوون، ئەوەی بهاتبایە گوندەکە لەدوورا ماڵی مەحموودئاشەوان و ماڵی کۆشکی ئاغەی دەبینی!، هەرلەحەوشەو حەسارەکە ناوبڕەیەکی پژدێنی کردبوو، ئەودیوی کردبووە هۆری مەڕی و ژوورێکیش بۆ شوانەکەیان، بەلام تاعوون تاقی لێ بڕیبوون، بیرێکی ئاویش لەحەوشەکە لێدرابوو و قەنات و بەکرەیەکی پوختەی لەسەر چندرابوو، کۆلی ئاو و ئالیکیشی لەڕۆخ بوو، جاران مەحموودی ئاشەوان ئەوێی پڕکردبوو لەمریشک وعەلەلیش، شەوان لەسەرناوبڕەکە هەردەقونجان.

زستانان و بەهاران ئاش ئیشی نەدەماو مەحموود ئاشەوان هەرخەریکی کەیف و سەفای خۆی بوو، بڕنۆیەکی دارشووشەو بەڕابێلەکی کوتک کونی هەبوو، هەسپیان زین دەکردو لەگەڵ بەگمێ بناروبناری قەرەچووغێ دەچوون، ئەوەندەیان نیشانانێ کردبوو! بەبێ نیچیر نەدەگەڕانەوە، بەگم سێرێ تفەنگێی لەنێچیرێ بگرتبایە قوتاری نەدەکرد، مەحموودئاشەوان چونکە کوڕی نەبوو، بەگمی کردبووە شێرەکچێک، لەسەرپشتێ هەسپێ لەنێچیری دەدا.

بەگم جگە لەحەمەخانی مێردی کەسی نەما، حەمەخانیش بووە خاوەنی حەوش و حەسارو کۆشک، هێدی هێدی ئاشەکە گوزەرانی باشتر دەکردن، ئەوەی دەهاتە دەستیان بە مەڕومالاتیان دەدا.

ساڵ سوڕایەوەو سەدای قرقڕەو زەنگوڵی مەڕ لەحەسارێ دەنگی هاتەوە، مریشک وعەلەلیش پەیدابوونەوە، بەگم هەسپی کڕینەوەو وەک جاران شریخەی بڕنۆیانی دەهاتەوە، مەڕ مێگەل بوونەوەو شوانی لێ گرتنەوە، گوند تەواو ئاوەدان بوونەوەو ژن و ژنخوازی دەستی پێکردەوە، ماڵی جەوهەر ئاغا گەڕانەوەو دەستەلاتیان وەرگرتەوە، دەیانویست خێرا قەرەبووی زیانەکانیانی ئەوچەند ساڵەیان بکەنەوە کەدەغڵودانیان نەکردبوو،

دەرگـایی دیوەخانێیـان کـردەوەو دەسـت و پێوەنـد پەیدابوونـەوە، هـەرچی زەوی بەیارهەبوو تۆیان دەکرد، ئەوەی کچی بەمێرد بدابا پێنج دیناریان لێ دەسەند، ئەوەی ژنیشی لۆ کوڕی بینابا دە دینار! ئەوەی دەغڵودانی بهاتبایە دەبوایـە بەشـی دیوەخـانی بـدا، مـەڕیان بەمێگـەل بوونـەوەو کۆشـک و خانوویان سواخ درایەوە، گوند ئاوەدانتربۆوە لـەجاران، گەنم شین بوو و بەهار فەرشی سەوزی خۆی لەکەندێناوە راخست، کەندوجۆم پڕئاوی باران بوون و ئاسمانیش پڕبۆوە لەباڵندەی کۆچەری، تۆرکەو کاردی و کەنگر هاتنەوە سەرئاگردان و بوونـەوە خوانی بەهاران، راوچی سواری هەسپان بوونەوەو تاژی رەشی چارچاو بەپێشیان کەوتنەوە، ئێواران بەگم بەهەسپێ خارخار دەچووە بەرایێ مەڕی و بەپیرشوانەوە دەچوو، بەینابەین شریقەی لەتفەنگێ دەینـا، جـاری واش هـەبوو بـەنێچیرەوە دەهاتـەوە، هەرهەسپەک لـەدوور تـۆزی بکردبـا، خـەڵکی گوندی مـەرجیان لەسـەردەکردو دەیـانگۆت بەقورعانێ قەدیم بەگمە.

هـاوین هـات، وەرزی بـەرگ و نـان، وەرزی خـەرمان و بەرەکـەت، دەغڵـودان دوورایـەوەو سـەپان و جوتیارئارەقـەیان رشـت، رەوسـەی گـەنم جیاکرانەوەو بەشیک بۆ تۆکردن هەڵگیرایەوەوهەندێکیش بۆ باراش ونـان، جۆ خرایە جوارو عـەمباران، قەسـەر کۆکرانـەوەو کـادین پڕ (کا) بوونـەوە، حەمـەخان و بـەگم دووای خـەرمانی گـەنم و جۆیەکـەیان، دەرگـای ئاشـیان کردەوە، کاروان دەهاتن و باراشیان دەخست،،

هێدی هێدیش تەماحی جەوهەرئاغەش لەئاشـەکە زیـاتر دەبوو، کەئەو هـەموو باراشـەی دەبینـی لـەپێش ئاشـەکەی نۆرەیـان گرتیـە، چـاوی یـەک بسـتەعەردی نـەدەبینی، ئـەوەی دەهاتـە بـەردەمی بەدەسـت و پێوەنـدەکانی دەگووت، هـەرۆگیڤی ئاغـەی لەگونـدی بڵاوببوونـەوەو دەیگـووت: حەمـەخان سـەپانەو بـەنان و زگ ئەوئاشـەی دەسـووڕێنی، مـەحموود ئاشـەوانیش

بەوجاغ کوری مرد، بەگم مێردی کردیەو هیچی ناکەوی، ئەوئاشە هی منەو هەردەمەکی بمەوێ لەئاوایی دەریان دەکەم،.

حەمەخان کەئەوقسانەی لۆدەگەڕاوە کپ دادەماو بێدەنگ دەبوو، چونکە پێشتر دەربەدەربووبوو بەهۆی ململانێی ئاغاوە،

بەلام بەگم بەهێواشی و بەرقەوە دەیگوت: ئەوە ئاشی بابمە، جەوهەرئاغە تەرسی خۆی گێرەدەکا، پیاو ئەوپیاوەیە بێتە بەرەو روو، سە گوندیان چۆل نەکرد لەترسێ تاعوونی!، جەوهەر ئاغە دەبی بەبیرەخۆی بینتەوە ئەو کییەو ئەمەش کێین،.

هەرچەند بەردەم ئاشەکە باراشی زیاتری لێبوایە، جەوهەر ئاغە زیاترسەرودری تێک دەچوو و هەڕەشەی زیاتری دەنارد، بەگمیش زوو زوو بەهەسپێ قووت و چاردەخۆر لەنێکێ دەردەکەوت و وەک برووسک تێدەپەڕی، دەمەوئێواران بەپیر شوانەکەیانەوە دەچوو و لەچواردەوری مێگەلی دەسووڕایەوەو بەبرنۆیە کورتەکەی یەک دوو پاکەت فیشەکی بەعاوایەوە دەنا، پاشپانی لەڕکێبێ دەداو جلەوی توونـد دەکرد، هەسپ دەیحیلاندو لەگوندێ دەنگی دەداوە، دەیویست بەماڵی ئاغەو داروودەستەکەی بلێ هەموو پارووبەک قووت نادرێ،.

( کانەبی)  پیاوێکی کەرەگەتی باریکەی رەقن، دەموچاو چورچ ولۆچ، دەستەڕاست و تەگبیرکەری جەوهەر ئاغەی بوو، مڕومۆی خۆشکردبوو ئەگەر ئاشەکە ببیتە هی جەوهەرئاغەی بەخۆی لێی دەبیتە سەرکار،.

جەوهەرئاغە کانەبی ناردە دوو حەمەخانێ و گەنمی لەسەر دۆرەدانەی پێ بەجێهێشت و هێنایە دیوەخانێ، جەوهەر ئاغە داوای لێ کرد ئاشەکەی بفرۆشێ یان بیکەنە شەریک، بەوردو باریکیشەوە پێی گووت ئەوئاشە هی ئێوە نیەو خۆتانی لەسەر گرفتارمەکەن،.

حەمەخان بەدڵتەنگی وعێدزی هاتەوەو باسەکەی بەتێری بۆ بەگمی گێڕایەوە، بەگم یەکپێ خۆی بەستاو بەسواری هەسپێ چووە بەردەم

دیوەخانێ و دەست وپێوەند زەندەقیان چوو، پەنجەی لەجەوهەرئاغەی هەرشەقاندو بەتوورەیی: ئاغە ئاغە، پێچک چارە بەژمارە، هاتیمە دووقسانت پێ بڕێم، عەیامەکە گێم لەقسەوقسەرۆک وهەرەشان دەبی، با کارلەکار نەترازی، هێسک بشکێ جێی خۆی ناگریتەوە، ئەوە ئاشێ بابمەو لۆ تاعوونی بەجیمان نەهێشت، ئەتووشمان دیت کوو ئاقارێ حەفت مەملەکەتانت بڕی».

جەوهەرئاغە بەتوورەیی وکەمێک ترسەوە: ئەمن جوابی حورمان نادەمەوە، ئەتوو زەعیفەی، سەش لۆ ژنان نایێ، قسەم لەگەر مێردە سەپانەکەت کردیە».

کانەبی هەندێک بەکزیەوە: ئەوعەردەی ئاشەکەی لەسەرە هەرئی بابم بووە.

بەگم بەتوورەیی و دەنگی بەرز: کانەبی وابزانم ئەتووش تیلاکت لەوخمەی دەنێی !، بابت هەتا مرد جەمەگۆشتەکی بەتێری لەمارێ خۆی نەخوارد، خەرکێ گوندی کراشێ بابتیان دیتبوو، کەس بەسەپانیش نەیدەویست، ئەتووش کوڕێ ئەوبابەی ئەگەر مارێ ئاغەی نەبی قون و شەروارت ئەوها نابی».

بەگم حیلەی لەهەسپێ هەستاندو گەڕایەوە، دۆخەکە زیاتر گرژبوو، پێنەدەچوو جەوهەرئاغە لەقسەکانی بەگمێ خۆشبی، تەماحی ئاشەکەش لەلایەک، داروەستەکەشی هەریەکەو پێشنیارێکیان بۆ دەکرد، پووشکەی لەعەردی وەردەداو دەیزانی بەگم پاروەکی ئاسان نیە».

(شێرۆی شەریف) یش پیاوێکی تری جەوهەرئاغەبوو، لەدزی و ئەتک و کەتندا ولاشی نەبوو!، پیاوێکی قوتەی کەپووفشی چاوزەقی گرەبوو، سەریکی بردە بن گوێی جەوهەرئاغەو بەچرپەوە: جەنابی ئاغە، ئەگەر حەزت لێ بی و پێت خۆش بی، دەرسەکی وەهایان دەدەمێ لەقیامەتێش لەبیریان نەچی!».

جەوهەرئاغە بەرقەوە: شێرۆ وەڵاهی ئەوە ئیشی تووە، بتبینم و نەتناسمەوە، شتەکی وەهابکەی جارەشکە زاتی ئەوەیان نەبی بەرامبەرەمن دەویان بگەڕێ.

شێرۆی شەریفی: ناتەوێ وەبکەم جارەکیدی ئەوئاشە تەپیەی لێوەنێ!، هەتا مایە مستەئاردەکی لێ نێتەخوارێ!.

جەوهەرئاغە: هەی بێ مێشک هەرایەکەی من لۆئاشەکەیە.

شێرۆی شەریفی بەخەندەیەکی گرەوە: ئێ ئێ جەنابی ئاغە خەمت نەبی، خاترت دەگرم، باوی ئەوەندەی دێلمەوە، بەخۆشم لۆت چادەکەمەوە قابیلە هەندۆکەکی لێدەزانم.

هەندەی نەبرد لەدرەنگانی شەوێکی ئەنگوستەچاو، چرەدووکەڵ و ئاگر لەئاشەکە بەرزبۆوە، هەتا لێی بەخۆکەوتن کرۆکۆی دامرکابوو، کاریتەی سەریشی ببووە خەڵووز، بۆنی قیرۆجفت گوندەکەی داپۆشیبوو، هەرچی بەرمیلە گازیش هەبوو گڕی گرتبوو، بەیانی بەگم و حەمەخانی مێردی بەدیاریەوە مۆلەق مابوون، کاروانێ گوندان لۆباراشێ دەهاتن و دەگەڕانەوە، خەڵکی گوندیش دەهاتن و بەدیاریەوە سەریان بادەداو دەگەڕانەوە، هەموو دەیانزانی ئەوە بەردی جەوهەرئاغەیە.

هەر زوو قوریان گرتەوەو سەرلەنوێ سەری خانووەکەیان کاریتەڕێژکردەوەو دیوارەکانیان سواخ دایەوە، ئاشەکە زۆر پەکی نەکەوتبوو و ئەوەی کەبەتەواوی سووتابوو مەکینەو بەرمیلە گازەکان بوو، حەمەخان بزربوو و نیوەڕۆیەک بەمەکینەوە گەیشتەوە بەردەم ئاشکە، وەستای لەگەڵ خۆی هێنابوو و ئاش بەگڕکەوتەوە، وەک جاران جمەی هاتەوە، بەلام ئەمجارە ماران گەستێ لەگوریسێ رەش دەترسێ.

حەمەخان شەوان کەئاشەکەی دادەخست سەگەبۆرەکەی لەژوورێ بەجێدەهێشت و دەرگایی لەسەرکلیل دەدا، شەوانیش لەسەرحەسارێ بەرامبەر ئاشەکە تادرەنگ نۆبەتیان دەگرت.

بەینا بەینیش دەنگۆی دزرانی دەمانچەو بڕنۆ دەبووە باس، زۆربەیی خەڵکی ئاواییش چەکیان هەبوو، چەک دزران لەدورژۆرێ قسەوفسەرۆکی زۆری هەڵدەگرت، شەوێک دەمانچەی عەولای حەمەدباپیری دەدزرێ!، سبیانێش مام سۆفی لەمزگەوتێ دەرێ: وەلاهی لەکم وابی ئەوشۆ وەختی کەبارێ (عەلی رەزا) م دیت بەپێخواسی دەلینگی هەرکردبوو! لۆلای مارێ خۆیان دەچۆوە، دەتگۆت بەبای دەڕوا!، هەست وخوستی نەبوو!، لەسەرپەنجەی پێی دەڕۆیی !،

ئەو خەبەرەی مام سۆفی بلاودەبێتەوەو مەجلیسی هەردوولا دادەنیشن،

: مام سۆفی ئەتوو بەچاوێ خۆت (عەلی) ت دیت وەختی کەبارێ؟ مەعلووم هەوبوو؟

مام سۆفی بەدوودڵیەوە: وەلاهی لەکم وابی هەوبوو!

: ئەخر مام سۆفی لەکم وابی نابی، خواهەیە خوا!

مام سۆفی دەستێکی کەوتە پاش و یەکی کەوتەپیش، مەجلیس هیچی بەهیچ نەکرد، هەموو ئەوانەی چەکیان لێ دزرابوو ئێواران پێکەوە لەسەرجۆخینان دادەنیشتن،

: وەلاهی ئەو عەلیە عەین ریویە! ئەو دزیانە هەمووی ئەوە،

: کاکە خەرک زۆر دەیبینن شەوان درەنگ دەگەڕێ لەگوندی،

عەلی رەزا کوڕێکی رەشتارەی باریکەی پرچ گروازە بوو، چاو درێژووکانی و برۆباریک، لاوازو ریتەو مل باریک، زۆربەکەمی دەهاتە ناوخەڵکی و مەجلیس و بەرمزگەوت، جارێ سبیانان هەتا نێوڕانی عەرد قووتی دەدا!، مەگەر پیش رۆژئاوا کەمێک دەرکەوتبایە، ماوەیەکی پێ چوو ماڵێک ژنیان دەگواستەوە، هەراوشایی و رەشبەڵەک بوو، شریخەی برنۆیان دەهات، سەعدۆ بەدەمانچەی چاردەخۆر گرمەگرمی بوو، (عەلی) یش لەسەر خشتەکی ئەوبەریان بەکزی دانیشتبوو!، بووک هات و نان خوراو

پەرتەی لێ کراو هەرکەس چوونەوە ماڵی خۆیان، سەعدۆ شەوێ درەنگ لەبەر لامپای چاردەخۆرەکەی جوان خاوێن کردەوەو هاوێشتیە بن سەری، سبەینێ هەستاوە دەمانچەکەی نەمابوو!، لەماڵێ دەرپەڕی و بەجوندان لۆ ماڵێ عەلی رەزای چوو، لەبەرەخۆی دەیگووت: وەلاهی داکی بابت هەردەگێم، ئەمن دەمزانی ئەتوو دونێ بەبەلاش چاوێ خۆت حیزنەکردیتەوە«.

دووبارە مەجلیس دانیشتەوە!، وەرن قورعانێ بخۆن«.

عەلی دەستنوێژیکی موستەهەقی هەرگرت و دەستی بەقورعانێ داداو گووتی: سەروسەربردەم تێدانیە و علموخەبەرم لێ نیە«.

دووبارە مەجلیس هیچی بەهیچ نەکردەوە«.

گوند پڕببوو لەباسی عەلی، یەکێک دەیگووت وەکی خدرێ زندەی لێ هاتیە، هەندێک دەیانگووت هەر هێسک و پیستە! سەش خەبەری پێی نابێتەوە!، خۆ وەکی دەڕوا هەست و خوستی نیە!«.

هەندەی نەبرد برنۆیەک دەدزرێ و لەئاخوڕی حەسارێ ماڵی گولیزەرێ دیترایەوە !«

دووبارە مەجلیس دانیشتنەوە«

عەلی: ها خۆنارین ئەوەش عەلیە؟

چەک لێ دزراو: ئەخر عەلی، گولیزەرەکی بێوەژنی دووسێ سەرکەو بنکەی هەیە، تفەنگی پێ دەدزرێ ؟ دوایێ ئەو بەخۆی هاواری هینایەو گۆتی تفەنگەک لەبن ئاخوڕێ مەڕی شاردرایەتەوە!، تاریک و رۆنی بەیانیانیش کەسەکی باریکەی دیتیە، دەلینگی هەرکرابووەو لەسەر دیوارەکەیان پازیدایە، بەخوای عەلی لەتوو زیاتر کەس نیە«.

عەلی: لۆ دیارە لەو گوندەی کەس ناتانی بچیتە سەردیواران؟«

دووبارە مەجلیس هیچی بەهیچ نەکردەوە!«

ماوەیەکی تر دیسان بووک گواستەوەیەک هەلهەلەی لێ بەرز دەبۆوە، رەشبەڵەک تێکەڵ ببوون، عەلی دوورو نزیک دانیشتبوو، خەت خەتۆکەی بەپەلووکە بەردان دەکرد!، لەترسێ عەلی کەس نەدەوێرا تەققەی بکا!، نەوەک عەلی تەماح لەچەکەکەی بکاو شەوێ بێتەسەری،

+ کورە وەللا عەیبە سیلمە سەیەکی ئەوها، لەپاش تاعونێ بەجێمای ئەو دەردەی بداتە خەرکێ گوندی!، هەقی وەیە وەکی سەی بیتۆپێنین،.

+ سەبرەکێ بگرە هەتا عزرایل لێی بەخۆدەکەوێ،.

ئەسکەندەری مامزێ لەسەر ماینێ چاردەخۆری دەریناو هاواری کرد: ئەگەر عەلی گونێ من بدزی،.

یەک ئێدەگی بەسەر رەشبەڵەکێدا هاوێشت،.

قەدەرێکی پێ چوو، شەوێک ئەسکەندەری مامزێ لەسەربانێ دەخەوێ، تا ئاگایی لەحەوش وحەساری مەڕومالاتەکانی بێ، سبیانێ هەڵدەستێتەوە دەمانچەکەی لەبن سەری نەماوەو گووەکیش لەتەنیشت سەری کرایە!.

دووبارە مەجلیس دانیشتنەوە!، عەلی وەک چەندجارە دەستنوێژێکی پوختەی هەڵگرت و لەبەرەخۆی دەیگووت: ئەوهابڕوا فێرە نوێژیش دەبم، کەس نازانی خێرلەچ دایە،.

دیسان عەلی سوێندی خوارد کەسەرو سەربردەی تێدانیە،

مەجلیس خۆیان هێناوبرد و گووتیان: عەلی بەکەلامێ خوای دەمانچەکەی ئەسکەندەریشت دزی و گووەکەشت لەبن سەری کرد

شەوێکی درەنگ بەگم لەسەربانێ هەستێ خۆی راگرت سەگەبۆر دەوەڕی و شێت وهاربووە !، خێرا حەمەخانی ئاگادارکردەوەو برنۆ و چاردەخۆریان دەست دایەو هەریەک بەلایەکدا بەرەو ئاشەکە رۆیشتن، دوورونزیک خۆیان دانووساند، بەگم تارماییەکی بینی!، خێرا پێشی لێ گرتەوەو لەبەری دانیشت، هەندەی نەبرد لەسەرپەنجان وەک (با) ی

دەهات، نەدەنگی هەبوو نەخشپە، چاوێکی کردبووە هەزارچاو، تەواو لەبەگم نزیک بۆوەو نەیدیتبوو، بەگم لێی هەڵسایەوەو لوولەی بڕنۆی لەسەر ملی داناو پێی گووت: بجولێی سەرت کەرت دەکەم،

بەگم چەکی کردو دەمامکەکەی لەسەری هەڵدایەوە بینی (عەلی) یە!

عەلی بەپاڕانەوە: بەگم تخوا مەمکوژە.

بەگم بەنزمی وتوڕەییەوە: سەگباب ئەتوو ئاشەکەت لێ سووتاندم.

عەلی: بەکەلامێ خوای ئەوئیشە ئیشێ من نیە، بەرام بەچاوێ خۆم دیتم شەو ڕاشکابوو شێرۆی شەریفی لەمارێ هاتەدەرێ، ئەمنیش لەدووی چووم زانیم گۆبەندێکی لەبن سەریە!، چاوی دایە ئاشەکەی و هەندەی نەبرد برێزەی ئاگری لێ برندبوو، بەخوای بەگم ئەمن هەرچم کردبێ کردیتم، ناریێم پیاوەکی باشم، بەرام قەت کەیفم بەئاغەو پیاوەکانی نەهاتیە، مەمکوژەو ئاشکرام مەکە چی برێی لۆت دەکەم،

بەگم: چم لۆدەکەی؟.

عەلی: تۆرەی سووتانی ئاشەکەت لۆدەکەمەوە، دەبی لۆت بسەلمێنم ئەمن ناحەزێ توونیمە،

بەگم چەکەکەی دایەوەو عەلی هەتا بزربوو ئاوڕی دەداوە، هێشتا دڵنیانەبوو بەگم تەققەی لێ دەکا یان نا !،

هەندەی نەبرد شەوێک کلکی ماینە شێیەکەی جەوهەرئاغەی لەحەسارێ بڕابوو، ئەو ماینەی جەوهەرئاغە پێی دەچووە مێوانداری و سەفەران، کلک برینی رەشەوڵاخان ئەتکێکی گەورەبوو پیاوی لەسەردەهاتنەکوشتنێ، ئەوەی کلکی رەشەوڵاخی ببڕابا لەپیاوەتی دەکەوت!، تامردن نەدەوێرا لەمەجلیسان دەنگ هەڵێنێ،

لەوەش کارەساتتر لەوحەسارە قایمەی ماڵی ئاغا چۆن کەسێک توانی بەنێوان سەگە دڕەکانی ئاغا ئاودیو ببێ و لەنێو ئەوهەموو مەڕوماڵاتە، ماینەکە ببینێتەوەو ئەوئەتکە گەورەیە بکاو کەس نەیبینێ و بگەڕێتەوە ؟!،

بــەیانی کــەس نــەدەوێرا قســەلەگەڵ ئاغــا بکــا، دەیکوشــت و نەیدەشاردەوە! جارێ زوو دارودەستەو پێوەندەکانی شووشتەوە، هەناسە بڕکێی گرتبوو و هەروگیڤی دەکرد، هەواڵ بەنێو ئاوایی بڵاوبۆوە ئاغا ئەتک کراوە!، هەمووکەس باوەڕی نەدەهات!!، ئاغا ناچار بڕیاریدا ماینەکە لەحەساری نێتەدەرێ و کەس نەیبینێ، بەگمیش هێوارێ دەمەو ڕۆژئاوا بەسواری هەسپێ چووە بەرایێ مەڕی و بەینابەین فیشەکێکی بەحەواوە دەنا.

زستان بارگەی خستبوو و پەرەی دابوو، جوتیار بەپاشۆلان تۆیان کردبوو، چاوەڕێی خەرمان بەرەکەت و ڕەوسەی هاوینیان دەکرد، شەوێکی ساردی ئەنگوستەچاو، شێتە (با) گڤەی دەهات و زەفەری بەپیاوی دەبرد، پنچکە دڕکی کەندێناوەی لەگەڵ خۆی غڵ دەکردەوە! سەگ لەکۆندڕەکەی خۆی سەری بردبووە هەناوی!، ڕەشەبایەک ئەوەی بەچنگی بکەوتبایە بۆئەبەد نەیدەهێنایەوە!، پیاو لەژوورەکەی خۆی ترسی لێ دەنیشت!، سێ بەشی شەو ڕۆیشتبوو، دەنگی دووفیشەک هات!، حەمەخان چراکەی گەش کردەوەو لەنهۆمی سەرەوە هەستی خۆی ڕاگرت و بەگمی هەشیار کردەوەو پێی گووت: ئەو تەققانە لەنێزیک ئاشەکەی بوو.

هەردووکیان خۆیان بەستاو هەریەک بەلایەک بەهێواشی بەرەو ئاشەکە چوون، هێشتا بەگم نەگەیشتبووە ئاشەکە دەنگی سێ فیشەکی ترهات !، بەگم لەئاشەکە نزیک بۆوەو هەستی ڕاگرت سەگەبۆر دەنگی نەبوو!، سەری لەپەنجەرەکە ناو چاوی لێ تیژکردنەوە سەگەبۆر خوێنی لەبەر ڕۆیشتووەو کوژراوە!، میلی بڕنۆکەی ڕاکێشاو فیشەکێکی لێ خوڕی، دڵی خوڕپەی کردو گەڕایەوە ڕێگاکەی حەمەخان، بینی خەڵتانی خوێن بووەو هێشتا جولەی ماوە، سەری خستەسەر ڕانی و حەمەخان بەبێتاقەتی چاوی هەڵێناو بەنووسکەوە: بەگم واز لەئاشەکەی بینەو مەڕوماراتەکەی ببەو بڕۆ مرکێ، باب وبرام لەوێنە بەکەلکت دێن، ئێرە کەلکی تووی نەما.

بەگم بەدڵۆپەفرمێسکێکەوە: نازانی کێ تەققەی لێ کردی؟.
حەمەخان: بەگم گەردەنت ئازابی، وەسیەتم هەرئەوەیە لەکەندێناوەی بڕۆی،.

حەمەخان بەرەو دووامەنزڵگایی خۆی رۆیشت و بەگمی بەتەنیا لەئاش و کۆشک و حەسارێ بەجێهێشت، حەمەخان لەمرکێوە نان وسەپانێتی بانگێشتی کەندێناوەی کردبوو، وەک کۆترێکی سیا، لەسێبەری درەختێک بگەڕێ، وەک کاروانێک ئەستێرەیەک ئاوڕی لێ دابێتەوە،.

بەگم موکڕتر لەجاران، بەڵام بەتەنها ئیش وکاری ئاشەکەی پێ رایی نەدەکرا، بۆیە دەرگای لەسەرداخست، قەوانی ئەو سێ فیشەکەی هەڵگرتبوو کەحەمەخانی پێ کوژرابوو، لەفیشەکی هیچ تفەنگێک نەدەچوو!،

بەگم رووبدایە ئاژەڵداریەکەوبەیانیان شوانی بەڕێدەکردو پێش رۆژئاواش هەسپی زین دەکردو بەپیر مێگەلەکەیەوە دەچوو، ناو حەسارێ پڕ کردبوو لەچرا، لەژوورەکانی نهۆمی سەرەوە لەهەر دەلاقەیەک چرایەکی دانابوو، سەرلەئێواران سەگەکانی لەحەوشەی بەڕەلا دەکرد، لەسێ چوار ژووران جێگەی رادەخست و بالیفی لەجێگەی خۆی دەنواند!، بەخۆشی لەتاریکاییەک خۆی دادەنووساند، شەو هەبوو لەهۆرێ مەڕی نۆبەتی دەگرت، هەردەم بیریشی لەبکوژی حەمەخانی مێردی دەکردەوە، ئەو دڵنیابوو بەفیتی جەوهەرئاغە کوژراوە، بەڵام مەراقی لەبکوژەکە گرتبوو، یەک یەک خەیاڵی بەرەو داروودەستەکەی دەچوو!، نەیدەزانی کامیان هەڵبژێرێ؟،.

بەهارهات، حاجیلەو نیسان سەریان لەنێو فەرشی سەوزی کەندێناوە دەرهێنا، ئاسمان پڕببوو لەئاوازی باڵندەی کۆچەری، جەوهەرئاغە لەسەرەوەیماڵی خۆیان لەسەربستێ، لەبەرامبەر ئاشەکەی بەگم وحەمەخانێ ژوورێکی درێژی بەداروودەستەکەی درووست کرد، ناردی ئاشێکی بۆهات و دووکەڵی لێ بەرزبوونەوە،.

بەگم هەرلەخەیاڵ وتەگبیری بکوژەکەی حەمەخانی مێردی بوو، ئێوارەیەک هەسپی زین کردوو چووە بەرایی مەڕی، عەلی رەزاش هێدی هێدی چووە سەر رێگایی و خۆی لێ نزیک کردەوە،

عەلی: ماندی نەبی.

بەگم لەسەر پشتی هەسپێ: بەخۆت ماندی نەبی، عەلی دەرێی قسەکت پێیە؟.

عەلی: گۆتم بزانم سەرەداوەکت بەدەست نەکەت، لەمەڕ کوژرانی پیاوەکەت؟.

بەگم: هەندۆکەکی لێ دەزانم، بەرام ئەوفیشەکەی حەمەخانی پێ کوژرا پێشترقەت نەمدیتیە! مەگەرخوا ئەتوو لێ دەزانی.

عەلی بەخەندەیەکەوە: ئەمن دەزانم ئەوفیشەکە هی کێیە، لەوگوندەی لەجەوهەرئاغەی زیاتر کەس لەوتفەنگەی نیە!، ئەوە سەمینۆفی پێ دەرێن، قەوانەکەی رەشەو بەخۆی فیشەکی دەباتەوەبەرێ !.

بەگم دەستی لەڕەختێ تفەنگێ ناو قەوانەکەی بەعەلی نیشاندا.

عەلی بەخەندەیەکەوە: ئەگەر دەتەوێ درت ئاوی لێ بخواتەوە، پاش عەسران تاقیبەکی جەوهەرئاغەی بکە دەچیتە سەرکەندێ زیخماران و لەوێ نیشانانێ دەکا، پاشان برۆ جێیەکەی بزانە لەو قەوانەیە یان نا؟، ئەخر ئەمن دەزانم لەو کەندێناوەیەی چەند تفەنگ هەیە.

بەگم: عەلی ئەگەر ئەوقسەت راست بوو هەسپەکت لۆدەکرم.

عەلی: هەمووعەمەلەکم هەبی ئەوعەمەلەم نیە درۆی بکەم.

بەگم دوورونزیک عەسران چاوەدێری جەوهەرئاغەی دەکرد، هەستێ خۆی رادەگرت نیشانانێ بکا، هەندەی نەبرد عەلی خۆی گەیاندەوە بەگمێ و پێی گووت: واجەوهەرئاغە نیشانانێ دەکا لەپشت قەبرستانێ، بەگم چاوەدێری کرد تا گەڕانەوە، چووە جێگاکەیان و قەوانەکانی هێنا، هەمان قەوان بوون کەحەمەخانی پێ کوژرابوون، یەک دوو رۆژی پێ چوو دیسان

عەلی خۆی گەیاندەوە بەگمیٚ وپیٚی گووت: هاچت کردەوە؟ چاوم لیٚ بوو چووی قەوانەکانت هەرگرتەوە!.

بەگم: قسەکەت راست دەرچوو، دەمەشکە گەیشتمەوە ماریٚ وەرە مەڕەزایەکت دەدەمیٚ دووبەرخی لەبەرە.

عەلی کەمەک بەترسەوە: ناوەلا مەڕم ناویٚ، بەرام دەریٚم ئەتوو هیٚشتا پیٚویستت پیٚم دەبی، ئەگەر پیٚم رازی ببی بەقورعانیٚ قەدیم واز لەئیشیٚ خراپ دینم و لەگیٚ وعەمدیٚ یەک دەبین.

بەگم بەتووڕەییەوە: عەلی وەمەکە لیٚت بادەمەوەو فیشەکەکت لەتەختی نیوچەوانی بدەم و لەکۆر خەرکیٚ گوندیت بکەمەوە.

عەلی بەپەلەپەل: نانا، بەخوای تەواو تەواو، جارەشکە نامبینیەوە.

بەگم: هەها عەلی خوا شایەدە بیٚ پرسی من لەماریٚ و حەساریٚ نیٚزیک ببیەوە، جامی سەرت دەفڕیٚنم، ئەمن ئەو قوون بەڕیخانە نیمە ئەتوو چەکیان لیٚ دەدزی، خوا شایەدە قەبرت بن ئاخوڕی ئەو هەسپەی دەبی.

عەلی بەدەم ولچیٚکی تیٚک ئالاوە: بەخوای بەگم مەڕەکەشم ناویٚ، هەربەولاش دانایەم.

بەگم دەرگایی لەسەر دوودڵی داخست و دەرگایی پلانیٚکی نویٚی کردەوە، بەردەوام خەریکی سیٚ رسکانیٚی تۆڵەسەندنەوەی خویٚنی حەمەخان بوو، بیری لەئاسنیٚکی داغ دەکردەوەو لەچ دەروازەیەکەوە کەف وکوڵی خویٚنی هەڵچووی دامرکیٚنیٚتەوە، عەلیش زوو زوو دەچووە بەراییٚ میٚگەلی بەگمیٚ و هەواڵی ماڵی ئاغەو داورودەستەکەی لۆدەبرد، کانەبی و شیٚرۆی شەریفی ببوونە سەرکاریٚ ئاشەکەی ئاغەی، (جیهانگیر) ی کوڕیٚ ئاغەش کەلەدووای سیٚ خوشکان ببوو، سەرپەرشتی دەکردن، بەگمیش تادەهات زیاتر زەین و بیری خۆی چڕتر دەکردەوە بۆ وەشاندنی گورزیٚکی گەورە.

ئەوساڵە هاتیٚکی بەبەرەکەت بوو، کەندوجۆم ووشک نەبوونەوە، دەغڵودان زۆربوو، کاروانیٚ گوندەکانی کەندیٚناوە نەدەپسانەوەو ئاش

نـەدەکوژاوە، کرێی باراشیان زیاتر کردبوو، جەوهەرئاغـەش هەرخـەریکی ڕاوشکاو سەفەرو داوەت و دیوەخانان بوو لەگەڵ ئاغای گودەکانی تر.

دووســاڵ زیـاتر بەســەرکوژرانی حەمــەخانی تێپــەڕی بـوو، مانـگ لەومەملەکەتـە بنەوبارگـەی خـۆی پێچابۆوە، پـایز تـازە دەسـتی بەسـەمای ئێوارانی کردبوو، پۆل پۆل سەفەری گەڕانەوەی باڵندەکۆچەریەکان ئاسمانی دەنەخشاند، تاریکە شەوێک هەر لەئێوارێوە چاوەکانی لـەکل دەنـان، باراشـی بەردەم ئاشەکە دەیانگووت ئەمشـەو تادرەنگ دەمێنینـەوە، بـەگم زوو خـۆی یەکلایی کردبۆوە، تەپەتەپی ئاشەکە هەمووگوندی پڕکردبوو، بەگم خەریتـەو بڕنۆو چاردەخۆری لەخۆی قایم کردو لەسـەر دەروازەی گونـدی سـوڕایەوە بەرامبەر ئاشەکە، لەسەر بستی لێی درێژبوو، هەستی خۆی راگرت و چاوی بەدیار ژووری ئاشەکەوە چڕ کردبۆوە، لەبـەر روونـاکی فـانۆس و لامپاکـان دەیبینی کەباراشێک تەواو دەبێت کـەروبارێک دەڕواتـەوە، هێشـتا نەیدەزانی کێ دەبێتە نێچیری ئەوشـەوەیی و بەیانی تەلقین بۆکێ دەدرێ!، ئـەو لـەنێوان کانـەبی و شـێرۆی شـەریفی و جیهـانگیری کوڕەگـەورەی ئاغـەی بژاردەی نەبوو، چاوەڕێی رۆیشتنی دووایین کەروبارو کوژانەوەی ئاشـەکەی دەکرد، پایزەشـەوێکی تاریـک بـوو، لـەکاتێک ئاشــەکە کوژایـەوە، ئاشـەوان ئەوەنـدە بـەدیار تـەپەتـەپی ئاشـەکەوە قسـەی لەگـەڵ خـەڵک کردبوو، هێشـتا بـەدەنگی بـەرز قسـەی دەکـرد، بـەگم میلـی بڕنـۆی راکێشـاو فیشـەکێکی لـێ خـوڕی، کـەمێک دووریـش بـوو بـەڵام ئەوەنـدەی راو و تفـەنگانێ کردبـوو، لـەخۆی دڵنیابوو کەتەقەی بەخەسارناچێ،

لەدڵەوە دەیگووت: حەمەخان ئاگات لییە کوو دەففەی سینگیان شـەق دەکەم و ژەهریان بەدەوی وەدەکەم؟، لێناگەڕێم بسێنەوە بەدیار خینی تـوو، دەی وەرنــەدەرێ هــەتا کــەلاکتان فرێدەمــە کەنـدێ، زووبـن فیشـەکەکانی حەمەخانی چاوەڕێتانە، شەرتێ خوای بی بتانکەمـە عیبرەت لۆ کەندێناوەی،

کوو ئەنگۆ دەستتان چووە سەرداریٚ منٕ؟، دەبی بزانن مست لەدریٚشەی دەگەڕیٚتەوە، جام پڕبی لیٚی دەڕژیٚ».

هەندەی نەبرد هاتنەدەریٚ و غڕڕەی داخستنی زنجیری دەرگاکە هات، دیاربوون سیٚ کەس بوون، هەریەکەو فانۆسیٚکیان بەدەستەوەبوو، بەگم سیٚریٚی لیٚ داگرتن و لەدڵەوەگووتی: ئەوەی لەبەراییٚ دەڕوا دەبی کوڕە گەورەکەی ئاغەی بی!، دووەکەی دی کانەبی و شیٚرۆن!».

نیشانەی داگرت وهەناسەی لەخۆی بڕی، گرمەی لەوەی پیٚشەوە هیٚناو خیٚرا فیشەکیٚکی تری لیٚ خوڕپەوەو گرمەی لەوەی دووهەمیش هیٚنا، ئەوەی سیٚهەم فانۆسەکەی فڕیٚداو دەرپەڕی، بەگم فیشەکەکانی تریشی پیٚوەنا، بەڵام فایدەی نەبوو! کەوتە نیٚو تاریکایی شەو!،

بەگم دڵنیابوو داری خۆی لەڕۆحی دان، خیٚرا وەک برووسک و بەور بەپشتەوەی گوندی خۆی گەیاندەوە حەساریٚ ودەرگاکانی داخست و لەنهۆمی سەرەوە هەستی خۆی راگرت، بەباشی گویٚی لەهاوارو شین و واوەیلایان بوو، زۆریش پەرۆشی هەواڵیٚک بوو، دەویویست بزانیٚ فیشەکەکانی سنگی کامیانی شەق کردووە؟، لەدڵەوە دەیگووت: چەند خۆشە جەوهەرم کوشتبی ؟، نانا خۆزگە کوڕەکەی بی و جەوهەر لەناو خیزاوەوە بمینیٚ، دەی دەی خۆ شیٚرۆی شەریفیش بی هەریەک مەعدەنن».

تادونیا روونـاک بوو بەگم لەنیٚوان گومان و خۆزگەکانیدا ئۆقرەی نەمابوو!، شوانەکەی لەودیو حەساریٚ هەڵساو مەڕی رادا، بەگم بۆهەواڵیٚک بیری بۆهەزار سەردەچوو، لەدڵەوە دەیگووت: باشە بریٚ لۆئەوها (عەلی) ت ترساند ؟ ئەگەر مەڕەزایەکەت بدابایێ ئەلعان خەبەری لۆهینابووی، باشە خۆ قسەکی خراپی نەکرد ئەوها سعوودت شکاند!».

تـا بەرەبەری رۆژئاوا هیچ هەواڵیٚکی نەگکەیشتیٚ !، هەسپەکەی زین کردو رەختی چاردەخۆری بەستاو رۆیی لۆبەراییٚ مەڕی، گەلەک چاوی لەعەلی گیٚڕاو خۆی دواخست بیٚ فایدەبوو، لەگەڕانەوە رۆژئاوابووعەلی

هێدی هێدی دەهاتە دەرێی گوندی و بەپیربەگمێ دەچوو، عەلی زەینی ئەوەندە تیژبوو دەیزانی مەڕێ بەگمێ لەچ پەرێزێکن!، دەیزانی چ ژنەک زگی هەیەو چەندی ماوە!، دەیزانی کاوڕێ کێ پێراگەییەو چەندی نێرەو چەندی مێیە! دەیزانی چێرێ کێ زایەو چەند گۆلکی هەیە!.

بەگم لەعاسمانان بەدووای دەگەڕاو لەنشێوان کەوتە دەستی، عەلی لەدوورەوە لەترسان خەندەیەکی لۆکردو بەگم ماندونەبوونی لێ کرد.

عەلی: بەخۆت ماندی نەبی.

بەگم: عەلی قسەوقسەرۆک چ هەیە؟

عەلی بەخەندەیەکەوە: ئەگەر خێ بکەویتە ناو ئاوێ، چ دەمینی؟ پێشتر دەیانگۆ ئەگەر کوڕهەبی تاریکەشەو زۆرە!، ئەلعان ئەتوو تۆزێ منت شکاندیە!.

بەگم: عەلی بیبرەوە هەوکە چ بووە پێم برێ ؟.

عەلی بەلچێکی شۆڕەوە: ئەوشۆ جیهانگیری جەوهەرئاغەیان لەبەینی مارێ و ئاشەکەی کوشت و شێرەی شەریفیش گردەبڕ رانی شکایەو بردیانە شاری.

بەگم: پێم ناخۆش بوو، جیهانگیر دووربوو لەفیتنەو ئاژاوان.

عەلی بەخەندەیەکەوە: ئەوەی لەمشک بی هەمبان دڕە، ئەدی نارێن نەزان پێیەکی دەکەوتە قۆرتێ و زاناش هەردووپێ!، شێرەی شەریفیش پێیەکی فت، هەتا لەسەر تاتەشۆرێ دەیشۆن بەردێ تووی لەقونێ نابیتەوە!.

بەگم: باشە عەلی ئەگەر خەبەرو قسەوقسەرۆک هەبوو هێواران وەرە ئەوناوەی، ئەگەر پارەو مارەشت دەوێ هەتا بتدەمی.

عەلی: نانا ئەتوو ساغ بی پارەم ناوێ، بەرام قسەک هەیە لەدرم بوویتە گرێ.

بەگم: عەلی پەرتاوان بکەی کاست دەکەم.

عەلی: زۆر زۆر وەکی شێرەی شەریفی لاقەکم دەشکێنی، لەکۆر چەک دزینێم دەکەیەوە، تازە هەرکەس ژنم ناداتێ، دزی وەها بەقوونم وەنووسایە، هەموو کەندێناوە دەمناسن، وەلاهی شەیتان دەرێ دەست نەپارێزم سەو گوجیلانیش بدزم، کەس پێم رازی نیە، ئەتووش ناوێرم قسەکی خێرێت لەگەربکەم، هەر زوو مردنم پێ پشان دەدەی، باشە ئەتوو تازە بەتەمای چی؟ قابیلە لەهەوەلی عومرتەوە هەتا مردنێ ئەوها دەبی؟ لەکەلی شەیتانێ وەرەخوارێ، بەشکو تۆبەی دەکەم، راستە ئەمن دزم، بەرام بەخوای خۆرپە دز نیمە، نانی بەرسێرێ کەسم نەدزیە، چەک دزینیش هەربەدزی حیساب نیە، بەرام خەرکی ئێرە ژنێ دەدەنە قوون بەرێخان! نادەنێ پیاوی شەوێ !، ئەخەر لۆیە ئەمنیش گەروویان تاردەکەم.

بەگم: عەلی رەزا شەقەشەقێ لۆمن مەکە، پارەت بدەمێ هەندە فیشەکم لۆ دەکڕی؟.

عەلی: پارەم ناوێ، لەخەوخۆشان بەزیادبی تێلەگە فیشەکەکم هەیە، سبەی لۆت دینمە ئێرە.

ئاشەکەی جەوهەرئاغەش داخرا، گوند بۆنی خوێنی لێدەهات، بەگم خۆی دەپاراست و بەدەگمەن دەچووە دەرەوە، شەوان لەهەر ژوورێک جێگەیەکی رادەخست و چرای لێ دادەگیرساند!، خەریتەو رەختی لەخۆی نەدەکردەوە، سەرلەئێواران دەرگایی حەساری شیش دەداو سەگەکانی بەردەدا، هەتا دونیا رۆناک دەبوو نەدەووست!، زەخیرەی داکردو خۆی قایم کرد، لەهەردەلاقەیەک وجێگایەکی قایم دووپاکەت فیشەکی دانابوو!، سال سوڕایەوەو عەلی رەزا ناوەناوە هەواڵ و قسەی ماڵێ ئاغەی بۆدەهێنا، بەگمی ئاگادار کردەوە کەجەوهەرئاغە سەرو سەمینیۆفی بۆ شێرەی شەریف و یەک دووێکی تر کڕیوەو شەوان خەریکی کۆرو کۆبەندن!.

شەوێکی ساردی سەختەبەند، تەمێکی چڕو پڕو کڕ کەندێناوەی داپۆشیبوو!، ئەستێرەکان بێ سەروشوین و مانگ تریفەی خۆی لێ وون

ببوو!، دونیا سامی لێ نیشتبوو!، شەوێک تەنها بەکەڵکی خراپە دەهات!، کەس لەنێونوێنیش ئارام و ئۆقرەی نەبوو!، مریشک و پەڕەوەلەکان چووبوونە کۆریتەکانیان، تەنها هەدێک عەلەلیش نەبێ لەسەر نیوەدیواری ناوبڕەکە سەریان خستبووە ژێرباڵیان، هەسپەکەی لەژوورەوە جارجار حیلەیەک یان پرمەیەکی دەکرد، مەڕەکان بەجۆریک پشتیان بەیەکەوە دابوو، تەنها بەهەڵمی کەپوویان لێک دەکرانەوە!، شوانەکەشی سەرلەئێواری لەژوورەکەی حەسارێی نووست، بەگم هەرچی فانۆس ولامپاو چرای حەسارو ماڵێ هەبوو دایگیرساندبوو، سەگەکانیش وەک چەند شەوە نەبوون!، خۆیان لەقوژبنان شاردبۆوە، تادەهات شەوەکە ساردترو تەمەکە چڕتر دەبوو!، شەو تەواو راشکابوو، زەلامێک لەسەردەرگایی حەوشە سەری هەڵکێشا!، دەمێک هەستی خۆی راگرت و ئاودیو بوو و دەرگای حەسارێی خستە سەرپیشت و بەهێواشی دووکەسی تریشی لەگەڵ هاتنە حەوشە!، چاویان لەپەنجەرەی ژوورێک چڕکردەوە، کەچرایەکی لێ دەسووتاو پێدەچوو بەگم لەناو جێگاکە نووستبێ!، بەئەسپایی لوولەی سەمینۆفیان بردە ژوورێ و یەکەم ئێدەگیان لەسەر بەتاڵ کردەوە، بەگم لەناو مێگەلی مەڕی لێیان قیت بۆوەو برنۆی لەسەر ناوبڕەکەی داناو تەققەی لێ کردن، ئەوان لای دەرگایان لێ گیراو هەمووانی لەهەیوانی پەستان، کەسیان نەدەوێران سەردەرینن، سەگەکانیش خەبەریان بۆوەو زیاتر جێگاکەیانی ئاکرا دەکردن، بەگم بەینابەین فیشەکێکی پێوەدەنان و زیاتر دەقژقژان، زەندەقیان چووبوو، دەیانزانی رێگەی چوونەدەریان لێ گیرایەو بەئاسانی لەدەستی بەگمێ دەربازیان نابێ، بەگمیش جارجار لێی دەقیڕادن و دەیگووت: وەرە دەرێ هەتا تەختێ نیوچەوانت بشکێنم، ئەمن بەگمێ مەحموود ئاشەوانیمە، دووفیشەکان لەنێچیر ناگرم، سبەینێ کەلاکێ هەمووتان بەوراغان لۆجەوهەری دەنێرمەوە، ئەوانیش بەینابەین سەری لوولەی سەمینۆفیان دەردەیناو یەک دوو فیشەکیان دەتەقاند، بەلام وەها

زەنـدەقیان چووبـوو فیشـەکەکانیان لەپێشـەخۆیان دەدا!، بـەگم دەسـتە لـەرزیوەکانی دەدیـتن، نیشـانی لـێ دەگـرتن و لـەتوزێی وەردەدان، دەمـەک دەنگ و بـەنگ نـەما!، دیـاربوو بـەناچاری بەپشـتەوەی ئـەودیوی مـاڵی بـەگم، بەسەرپشتی یەکتر ئاودیوو ببوون و قوتاربببوون.

دونیـا تـەواو روونـاک ببـوو، بـەگم هێشـتا ترسـی مـابوو لـەماڵێ وحەسارێ مابن، شوانە غەریبۆکەکەی بەرێکرد، هەتا چێشتانەیەکەی درەنگ هەستێ خۆی لـێ راگرتبـوو دەرگـایی حەسـارێ هەرلەسـەر پشـت مـابوو، گاسـێکی سـەگەکانی کـردو کـۆی کردنـەوە، پەنجـەی لەسـەر پـەلاپێکێ چاردەخۆری داناو بەپشت حەسارێ سووڕایەوە، شوونیان دیـاربوو بـەکوێ دا رۆیشتبوون، هێدی هێدی سەری بەژوورەکان دادەگرت، بینی جێگاکەی رایخستبوو و بـالیفی لـێ خستبوونە شـوێنی خـۆی، فیشـەک بـاران کـراوەو هەمان قەوانەکانی کوشتنی حەمـەخانی لـێ رژاوە!، ئیترهـەردوولایان لەیـەک ئاشکرابوون، ئەوان دڵنیابوون بـەگم مـاری بێ مەکانـەو لەخـەودا نـاکوژرێ، حەسـارئارام نیـەو هەرخشـتێک بەگمێکـە!، بـەگمیش تێگەیشـت لەمـەودووا بەتەنیا ژیان لەوحەسارە زەحمەتە، هەنـدێک جل وبـەرگ و پارەکـانی خستە بوخچەیـەک و خەریتـەی پڕفیشـەک کردنـەوەو سـواری هەسـپەکەی بـوو، چـاوێکی خێرایـی بەکەنـدێناوەدا گێـڕاو بیـری لەبـەرزایی و جێگەوهـەوارێکی تردەکـردەوە، رووی لـەبنارو بەردەلانـەکانی قـەرەچووغ کـرد، هـەرچی گردۆلکـەو بـەرزایی هـەبوو سـەرێکی پێـدادەگرت، نیـوەڕۆ هێشـتا تـەمومژ نەڕەویبۆوە، تاقە ژوورێـک سـەری بەبناری قـەرەچووغ کردبـوو!، شـوێنێکی گونجاو بوو، پێدەچوو ماڵی دڵشکاوێک بێ و ژیان هەڵەتەی کردبێ!.

بەگۆزینگ و پاشپانی تەکانی لەهەسپەکەیداو لێی نزیک بۆوەو دەنگی هەڵبڕی: مارێ، مارێ، مارێ.

ژنێکـی لەخۆگـەڕاوەی جـل وبـەرگ کـۆنی تـۆزاوی، سـەرپۆش دڕاو، دووبسـکی سـۆری خەنـەیی لـێ هاتبوونـە دەرێ، ددانـەکانی شـاش ببـوون،

بەلام پێدەچوو بەلاوی خەونی شەوانەی عاشقان بووبێ!، چاوی کاڵی هێشتا ماکی ئەوین و حەسرەت و یادەوەری پێوە مابوو، پڕبوو لەوباڵندانەی بەدیارخەمی مەفتەنەوە هەڵترووشکابوون، چاوی کاڵی وەک میوانسەرایەکی کۆن، پڕبوو لەخەونی ئەو کاروانچیانەی کەئیترناگەڕێنەوە..

بەگم: سەلاموعەلێک.

+ بەخەندەیەکی گەشاوە: عەلەیکەسەلام و ماندی نەبی.

بەگم: ئەدی مارومندارت ؟.

+ دووبارە بەخەندەیەکەوە: ئەمن بەتەنێمە، کەسم نیە..

بەگم: مێوانی رادەگری؟.

+ جڵەوی وڵاخەکەی گرت و: ئەدی کوو، بەخێربێی سەرچاوم،

بەگم لەهەسپەکەی دابەزی و سەری بەژووریێ داگرت، دوو کۆنە بەڕی دڕای رایەخرابوون لەگەڵ نیمدەرێک و بالیفێکی لوول، کۆنە فانۆسێکی بەتۆزوخۆڵ بەبزمارێک هەڵواسرابوو، دەلاقەیەک بوخچەیەکی شڕی تێدا هەڵوەشابوو، لەقولینچکێ کەچە تەباخێکی نەفتی کەڕەنگی خۆی پێوەنەمابوو، قاپێکی رەش هەلگەڕاوی لەسەربوو، سێ چوار هێلکەشی لەتەنیشت خەوتبوون، بەرمیلە ئاوێک لەولاتر قورپەکەی پسابوو، تەشیەک و گلۆرەبەنێکی لەسەربوو، خۆی هێناوبرد تەباخەکەی هەڵکردو چاوتێرانە هێلکەکانی برژاند کەپێدەچوولەوە زیاتری نەبێ، لەپارچە پەڕۆیەکی لوول دراو دوو نانی دەرهێناو نیوەڕۆیان بەسەربرد، بەگم دەیویست لە بابردەڵەیی ژنەکە بگات و هێدی پرسیاری دەخستە بەرگوێی..

بەگم: ئەوجە ناوت چیە؟

+ ناوم (زرێخ) ە.

بەگم: ئەدی کووە ئەوها بەتەنێی ؟.

زرێخ: برێم چ !، لەگەر قەدەرێ خوای چ ناکرێ، مرازم حاسرنەبوو، تازەش واعومرم بەسەچوو..

بەگم: ئەگەر جێم بکەیەوەو قبوورم بکەی لەگەرت دەژیم و ئێرەش ئاوەدان دەکەینەوە، ئەمن هەبوونم و مەڕوماراتم زۆرە، دووسێ ژۆران لێرە دەکەم و غەرەکی هەردەچنم و دە دوازدە بەژنانیش بیرەکی لێدەدەم هەتا دەگاتە ئاوێ، وەکی خوشکێ گەورەم بە.

زرێخ: رەببی خوا سەت هەندەت بداتێ، وەلا ئەمن چل دینارم هەیە، پار بوارێ گەلەکم کەنگرو تۆرکە فرۆشت.

بەگم: خەمی پارەت نەبی، ئەمن یەک حەسارە مەڕو بزن و کیسک و کاوڕم هەیە، چێرو گۆلکم هەیە، قازوعەلەلیش و مریشکم بەحیساب نایێ، پارەشم گەلەک زۆرە.

زرێخ رازی بوو و بەگم سواری و ولاخێ بۆوەو پێشی رۆژئاوا مێگەلی بەشوانەی گەیاندە هەوارێ زرێخێ، بیرلێدەرهاتن و بیرلێدراو دەولک شۆڕکرانەوە، کرێگرتەی گردەشینەی هاتن و قوڕیان گرتەوەو خشتیان بڕی، دیوارو سێ ژووری گەورەیان درووست کردوغەریان هەڵچنی، کرێگرتە ئێواران رۆژانەیان وەردەگرت و بەیانی زوو دەهاتنەوە، عەلی رەزا بەدەرکەوتەوەو شەوان زەخیرەو کەلوپەلی بۆ دەکێشایەوە، هەتا مریشک و جوچکەشی بەجێ نەهێشت، هێدی هێدی خۆیان رێک خستەوەو ماندووبوونیان دەحەسایەوە، فانۆس و لامپا گەورەکانی بەگمێ هەوارە شڕەکەی زرێخێیان رووناک کردەوە.

زرێخ خاوێن بۆوەو جل وبەرگ و سەروسەرپۆشی رێککەوتنەوە، لەگەڵ رۆژهەلاتێ لەخەوهەڵدەستاو تەققەی لەئیش وکاران دەبڕی هێدی هێدی رەنگ و رووی دەهاتنەوەبەرو ئومێد گەشی دەکرنەوە شەوێک بەگم تفەنگ و دەمانچەی لەپێش خۆی دانابوو خاوینی دەکردنەوە، بەدەم سڕینەوەیان پرسیار پەیدابوون و زرێخی بەقسان هێنا: لەهەڕەتێ عومرم بووم، هەژدە نۆزدە ساردەبووم، رووومەتم پەمبەپەمبە بوو، مەمکم دەتگۆ قۆچێ بزنێیە، زرپەی پێم دەهات، بەرام گەلەک فەقیرودەست کورت بووین،

عەزرەباتمان نەبوو، رووت و قووت بووین، جلک وبەرگمان ئەوەی هەبوو لەبەرمان بوو، داک وبابیشم بەناوسارکەتبوون، یەک برام هەبوو هێشتا پێرانەگەیشتبوو، هەر دە دوازدە سارەک دەبوو، گەلەکم حەز لەکوڕەکی گوندی بوو مێردی پێ بکەم ئەویش گەلەکی تەماحی لێم بوو، جوابمان لۆیەکتری دەناردو جارجار خەنەی لۆدەناردم، وەکی لەگە کیژێ گوندی دەچوومە سەربیرێ بەوێدا رەتەبوو تەمەشای یەکتریمان دەکرد، کیژ پەلاریان لێدەداین، هەندەی نەبرد هەناردیە داخوازیم، لەخۆشیان گەش بوومەوە، چوومە سەربیرێ و مزگێنیم بەکیژوکاران دا، لەخۆشیان بێ جلک و بەرگیم نەدەهاتە پیش چاوی، بابم لۆسبیانێ جوابی لۆناردنەوە گۆتی هێشتا کوڕم پێ رانەگەیشتیە، هەتا کوڕم گەورەدەبی و زرێخی لۆ بەژن دەدەم، راست هەناسەم ساردبوو، پاشان دووسێ جاری دیش دەوعای کردمەوە بێ فایدەبوو، بابم هەردەیگۆ دەبی لۆ برای ژنێ بکا، برایەکەشم هێشتا هەشت نۆ ساری مابوو.

قەدەرەکی پێ چوو لەسەربیری کیژ گۆتیان کابرای بەتەمات بوو ژنی هینا، تەزیەک لەتۆقی سەریدام هەتا بنی پێم، پڕی قوڕگم گریان بوو، گەلەک بێ هومێد بووم رۆناکایی لەدرم نەما، مامەوە هەتا برایەکەم گەورەبوو، داک وبابیشم مردن، برایەکەم ژن بەژنیەکی دیتەوە، قیچەک لۆمن تاخیریش بوو، ئاوقووفێ من نەمابوون بەرام گۆتم دەچمە مارێ خۆم.

گۆزرامەوەو سێ چار سارانیش لەمێردەکەم گەورەتر بووم، هەستم پێ کردبوو بەدری نیمە، لەترسان بەهەمووشتەکی رازی بووم، هەرچی بگۆتبا بەقسەم دەکرد، سار سووڕاوە کیژەکم بوو، وەمدەزانی عاسمان شەق بووە لیی هاتیتە خوارێ، مەمکم پڕ شیر ببوو لەبەری دەماوە، کیژ بە دەمانگان بەسەرپێیان کەت، خڕخڕ دەتگۆ ئاوریشمە، لەبەرئەوکیژەی ئاگام لەعەمری دنیایێ نەبوو، وەکی پێدەکەنی روحم لەگەری گەش دەبۆوە، هەر گۆرانیم لەبۆ دەگۆت،

کیژێ من بی کیژۆره، کیژێ من بسکی سۆره
کیژێ من بی کیژانی، سبەی دەچیتە کانی
کیژم بەلەنجەولاره، بەژنی دەریّی چناره
بابی چویتە هەولێرێ، کراسی لۆدێ هێواره
کیژم داخوازی هاتن، لۆی دەکرن جۆتە گواره

سبەینان لەپشتێ خۆمم دەبەستاو دەچوومە کانیێ، جەرە ئاوەکم دەینا، دەتکۆ پووشکەشم هەرنەگرتیە، دەهاتمەوە ئاگرم لەئاگردانێ دەکردەوە، هەتا نانم حازردەکرد هەرلەپێش چاوم بوو.

هەندەی نەبرد دەردهات، هەوەل مندار لەگوندی هی منی برد، وەخت بوو بەدەشتێ کەوم، بەمردیتیش دەستم لێ بەرنەدەبوو، روح گەلەک قەیمە، ئەگەرنا دەبایە ئەمن هەینێ بمرم، عەیامەکێ هەرئاگام لەخۆ نەبوو، لەپێش چاوم بزر نەدەبوو، بەتەنێ دادەنیشتم هەتا ماندی دەبووم دەگریام، مێردەکەشم جارجار بزردەبوو و دەهاتەوە، ماوەکی پێچوو دیسان زگم بۆوە، برۆکەک باشتر ببووم، زگم چارمانگ بوو مێردەکەم ژنی بەسە هینام و پشتی لێ کردم، رۆژەکێ دەریکردم و ناردمیەوە کن برام، لەوێندەریش درم گەلەک توندبوو، برام گۆتی ئەمن لەگەر ژنم چ عەیبم نیەو لەسە تووش لەخۆم تێک نادەم، جێ و رێشی نەبوو و ئەمنی لێ ببووە بەرا، جوابی لۆ مێردەکەم ناردەوە، مێردەکەم گۆتبووی نامەوێتەوە، لەمارێ برام گەلە غەریب بووم، گەلە کەساس بووم، لەوەختێ خۆم زگەکەم داناو کوڕەکم بوو، دیسان برایەکەم جوابی لۆ مێردەکەم ناردەوە، گۆتبووی نامەوێتەوە لۆخۆت بەمێردی دەوە، برایەکەشم شەوەکێ درەنگ کوڕەکەی لەباوشێ بردبووم و بەسواری کەرێ چووبوو لەهەولێرێ لەبن دیواری مزگەفتێ فرێیدابوو، هەستام لەخەوێ کوڕنەمابوو! روح قەیمەو هەرناقەرێ، هاوارهاوار بەلاشە ناگاتە خوای، هێواری برام هاتەوە چاوم پێ کەت، مردن بەهەرچەندەکی بایە هەرزان بوو، کەس نەبوو هانای لۆببەم، بەڕۆژ گریان

و سەردولکەم هەناوی کافری دەسووتاند، هێواریش وەکی برام دەهاتەوە نەدەوێرام بگرێیم، دەریبکردباما چ جێم نەبوو، مەمکم پڕ شیربببوو وەکی بەردی لێ هاتبوو، بەخۆی شیری لێ دەهاتە خوارێ، خەبەر لۆ ئاغەژنی چووبوو، ئاغەژن کیژەکی ببوو بەقودرەتێ خوای چوڕە شیرەکی لەمەمکی نەبوو!، لەدووی ناردم و چووم، چاوی پیم کەت بەژنە خزمەتکارەکانی ناردمیە حەمامێ، گەلە لەمێژبوو دژوون بووم و خۆم نەشووشتبوو، جوان جوان سەریان شووشتم و جلکێ ئاغەژنیان لەبەرکردم و لانکیان لەبەردانام، کیژ مەمکی گرتم و بەری نەدا !، رۆژ لەرۆژ جوانتر دەبوو، لەکن ئاغە ژنێ مامەوە، چم بگۆتبایە لۆی دەکردم، کیژ پێم وەنووساو دەتگۆ لەهەناوێ خۆم بووە، خەموکەسەرێ خۆم لەبیرکرد، ئەوەندەم لای لایە لۆدەگۆت، بەگریان وسەردولکان دەچوومەوە سەرمندارەکانی خۆم، مارێ ئاغەی هەبوون بوون کیژ گوارەی زێڕی لۆ کراو بازن لەقۆری، بووە سارەک و بەسەرپێ کەت، کیژ نەخۆشکەت و مرد، بەخۆم زۆرم لەدری بوو، گریانم دەگەیشتە حەفت عاسمانان، لەکۆشکێ ئاغەش جێم لەق بوو و مەڕیان هەبوو ئاغە ناردمیە بنەگەی، لەوێ لەگەر دووکچەتیمێ وەکی خۆم بێکەس خەریکی مەڕوماراتێ ئاغەی بووین، مەڕمان دەدۆشی و لەمەنجەرێ گەورە هێوێنمان دەکرد، سبەینان دەهاتن و دەیانبرد لۆ فرۆشتنێ، ئەوحەسارەی ئاغەی تەواوەک لەدەرێی گوندی بوو، مەڕومارات بێ حیساب بوو، لەوێ دەبایە هەرغاردەی، مەجالی گریان و سەردولکان نەمابوو، رۆژ بەشی مەڕدۆشین و ئالیک دان و هەوێزمارین و مەشکە هەژاندنی نەدەکرد، هەتا رۆژئاوا دانیشتن لۆمە نەبوو، شەوێش ئەوەندە هیلاکی رۆژێ بووم، بەحەسرەت دوو فرمێسکان بووم، لەوێ بەنان وزگ لەقەدەرێ خۆم راهاتبووم بەرام وەکی مەڕەک دەزاو داکی دەیلێستەوە هەناوم پارچە پارچە دەبوو، تەماشای لای هەولێرێم دەکردو لەدرێ خۆم دەمگۆت: دەبی

کوڕەکەی من لەباوشێ کێ بێ؟ دەبێ لەدووکێ بڕواو بەکێ برێ دایە؟ دەبێ شەوان سەرمای نەبێ؟.

شەوەکێ هاوین بوو، لەگەر کچەتیمەکان لەحەوشەی لەتەنیشت یەک دەنووستین، جێمان رایەخست، یەکەک لەکیژەکان فانۆسەکەی کوژاندەوە!، ئەمن پێم ناخۆش بوو، گۆتم نەوەک شەوێ هەستینەوە ئیشمان پێ بێ، بەرپێی خۆمان ببینین، بەرام بەقسەی نەکردم، گەلەکیش ماندی بووم و خەوم لێکەت، درەنگی شەوێ گێم لەمشەمشەکی بوو لەتەنیشتم!، تەواو خەبەرم بۆوەو چاوم کردەوە، دیتم پیاوەک لەتەنیشتم لەگەر کیژەکەی درێژبووە!، لەگەر زیڕاندم و هاوارم کرد، شوانەکە قیت بۆوەو سەرەوی هینا، پیاوەکە دەرپەڕی و کەتە ناو مەنجەرێ گەورەی ماستی کەهێوارێ هێوێنمان کردبوو، خەنجەرەکەشی بەجێما، سبەینێ زوو ئاغەو پیاوەکانی هاتن و خەنجەرەکەیان ناسی و شوونیان هەرگرت حەمەی شانازی بوو.

حەمەی شانازێ کوڕبوو، هێشتا ژنی نەینابوو، گەلەک قۆزبوو، دووکیژەکەش ئینکاریان لێ کردو بەملەمنیان داهینا، ئاغە حەمەشانازی تەنگاو کردو هەردووپێی لەپێراوەکی نا، گۆتی ئەمنت هەتک کردیە، دەتکوژم ئەگەر زرێخێ مارەنەکەی، کێ دەوێرا قسەلەقسەی ئاغەی بکا، حەمەی شانازێ بەناچاری مارەی کردم، بنەگەم بەجێهێشت و بەگەری کەتم.

حەمەشاناز لەمن گچکەتربوو، هەبوونیش بوون، بردمیەوە ماری لۆدانام، لەگەریشم خراپ نەبوو، زگی پێم دەسووتا، هەتا سارەکی چ عەیبمان نەبوو، بەرام خزم وکەس وکاری قسەیان پێ دەگۆت و دەیانگۆت بێوەژنەکت بەمل داهاتیە لەخۆت گەورەترە، ئیدی بەینابەینیش بزردەبوو و دەهاتەوە، ئەوجارە بزربوو و هاتەوە ژنەکی لەگەرخۆی هینابوو، کیژەکی جوان و ناسک، هەوەلێ عومری بوو، تەڕتەڕ دەتگۆ پەنیرە، بەرام گەلەکی رک لێم دەبۆوە، ئەمنیش عیلاجم نەبوو، رازی بووم بەهەموو شتەکی، هەموو ئیشەکم لۆ دەکرد و کۆریشم لۆ دەکردن، دەمگۆ بەس دەرم نەکەن،

چ جێم نەبوو بچمێ، سار سوڕاوە ئەو ژنە ژەهراوی بەدەوی وەدەکردم، لەسەرەمن لەگەر حەمەشانازێ دەبووە شەڕیان، دووکەدووک نەدەبڕاوە، حەمەشاناز گەرووی تارببوو، ناچاریان کرد تەراقم بدا، گەلەک پاڕامەوە گۆتم جێم نیەو لۆخزمەتێ خۆتان بمهێلنەوە، فایدەی نەبوو، ناچار سەرم هەرگرت و رۆیشتم، گۆتیان لەمەغمووری خەرک دەچنە داران کۆلکەی دینن و حوکمەت لێیان دەکڕیتەوە، پشتیە دارەکیان بەدرهەمەکی دەکڕێ، ئەمنیش رووم لەوێ کرد، ناردمیانە مارێ (قۆرچی) .

قۆرچی مەعاش خۆربوو، ژن و سێ منداری هەبوو، ژۆرەکی دامێ و دەرکەی لۆلەدیوی دەرێ کردمەوە، ئەو شەوەی لەخۆشیان نەنووستم، سبەینێ زوو قومەئاوەکم خواردەوەو غارمدایە چیایی و پشتیە دارەکی گەورەم هینا، بردمە پێش قشرەیی و ئەفەندیەک لێی کڕیم و گۆتی هەموو رۆژێ پشتیەکمان لۆبینە، ناونیشانێ خۆی دامێ و هەموو رۆژێ پشتیەکم لۆ دەبردن، ژنەکی هەن باشی هەبوو چاوی پێم کەت قەدە جلکەکی جوان و پێراوەکی نووشی لۆ کڕیم، ئیشم گەلەک باش بوو، بەتێن بووم هەردانەدەنیشتم، جستان رۆیی و کۆلکە هینان کەم بوو، نۆرەی کەنگرو تۆرکەو کاردی هات، هەموو رۆژێ پاشۆلەکم دەیناو دەمفرۆشت، بەبەر نەدەکەتم، دەهاتن لەمارێ لێیان دەکڕیم، شێست دیناری رەبەقم پاشەکەفت کرد، سەرت نێشینم هەندەی نەبرد ژنێ قۆرچی لێم بووە دوژمن، دیاربوو ژن پێیان گۆتبوو ئەوژنەی دەرکە باقۆرچی مارەی نەکاتەوە، ئەوانیش لەزگ بوو لەسەمن گەروویان تاربی، ژنەکە هەموو هێواران دەهاتە سەروگێلاکم و دەیگۆ دەبی بڕۆی، هیچ جێیەکم شک نەدەبرد!، کەس نەیدەحەواندمەوە، دەمگۆ سەبرەکم لێ بگرە، هەتا پەنایۆکەکی دەبینمەوە، دانە هێوارەکی تاخیردەهاتمەوە، پاشۆلەکم گەنگرو کاردی هینابوو، پیرێژنەک چاوی پێمکەت و هات لەگەرم دانیشت!، ئەمنیش دەستم بەبژاردنێ کەنگروکاردیەکەی کرد، گۆتی باشە لۆنایێ مێرد بەکوڕەکەی من

بکەی؟ پێنج کوڕم هەیەو بێ خوشکن!، ئەمنیش پیرم و تاقەتێ چم نمایە، ڕاست لۆخۆت وەرە سەرمارێ، ئەمنیش هەندەک فکرم کردەوە، لەولایە وا ژنەکەی قۆرچی سەری لەهەناوم نایەو دەرم دەکا، هەرچەندی سەرم هیناوبرد، لەوەی باشترم بەدەست ناکەوێ، خۆ بەخوای ئەمن مەعتەلی مێردی نەمابووم، بەرام بێ سێبەربووم، دەمویست لەو دەرو ئەو دەران نەبم، درێژەی نەدەمێ بێ ئەوەی کوڕەکەی پیرێژنێم دیتبی پێی رازی بووم، دوو رۆژی پێ چوو، هێوارەکێ پیرێژن هاتەوە گۆتی شەوێ دێمەدووت و حازربە مارەت دەکەین، هەر ئەوشۆکەش دەچینەوە مارێ، لۆخۆت بوزگوڕۆکەت تێکنێ، بەخێرایی دەست وچاوم شووشت و پاش مەلایی عیشائێ پیرێژن هات، لەگەری چووم و بەحەوشەیان کەتم، یەک دوو جیرانیشیان هاتبوو، مەلایان هیناو پسیاری داک وباب و کەس وکاری لێ کردم و گۆتم کەسم نەمایەو بابردەرەمە، مەلا گۆتی بەدینارەکی مارەی دەکەم!، دیاربوو مارێ پیرێژنێ گەلەک لەمن نەبوونتر بوون، گۆتیان وەلا دینارمان نیە!، مەلا ویستی بڕوا، لەدرێ خۆم گۆتم با لەسەر دینارەکی بێ سیبەر نەمینێمەوە، لەسەر روێ خۆم هەراوێشت و بەکزی گۆتم قەیناکە باتێک نەچی ئەمن دینارەکەی دەدەم، ئەوجا مێردم بەزایەری کرد، لەکۆر ژنێ قۆرچی بوومەوە، مارێ پیرێژنێ گەلە گەلە نەبوون بوون، ئەوەی لەماران هەبی نەیانبوو!، مشک کلکی بەئارد نەدەبوو لە کەندوویان، چاوەکیان لەجیرانەکان بوو، قاپە شیوەکیان لۆ بهاتبایە، وەلا خۆم لێ هەرکردو سبیانان زوو دەچوومە کەنگرو کاردیان، بەشێ خۆمان دەگێڕاوەو ئەوەی دیشمان دەفرۆشت، ئاگرم لەماریان کردەوەو شیوێ گەرمم لەپێش دانان، ماوەکی پێچوو هاوین هات و مەعلێ کەنگروکاردی نەما، مێردەکەم گۆتی دەبی شێست دینارەکەم بدەێی بەقاریی پێدەکەم، دەچم لەوبەری زێیێ رزق و تەماتەو شتی پێ دینم و لێرە دەفرۆشم، پارەکەم لەدوڕدەستی کرد، وەلا دەستی بەئیشێ کرد سبەینان تاریک و

رۆنێ دەڕۆیشت و هێواران دەهاتەوە، ئیشەکەی ئاش بوو عەیبی نەبوو، رۆژبەرۆژ قازانجی دەکرد، هەندەی پێنەچوو لەپێش قشرەی دووکانەکی داناو تەرازووەکی هێخستەناوێ و بەتەواوەتی بووە بەققار، دە مانگی رەبەق بوو لەکنی بووم ژنەکی بەسەهینام، ژن دەتگۆ لەئاگروپەنگری شەیتانێ بەربوویتەوە! ژەهری ماری بەدەوی وەدەکردم، نەیدەهێشت دەست دەمە هیچ شتەکی، هیچم لەدەست نەما، ئەو کیژبوو، جوان بوو، زایەر بەهەزاری وەکی منی نەدەدا، ئەمننەکی جەرگ سووتای چرکن و دژوونی بێوەژن، جێم لەوێش لەق بوو، ئاگرو پرتەو بۆرەی ئەو ژنەی نەکوژاوە، زایەریش ئەمنی بەقوربانی ئەوی نەکردو تەراقی دام، گۆتم فایدەی نیە، سێبەرم بەدەست ناکەوی، هاتمەوە کەندێناوەو ئەو ژۆرەش چۆل بوو، بواران کەنگروکاردیان دەینم و دەبەم لەمەغموری دەیانفرۆشم، وەکی ئەتووش هاتی گۆتم بەخوای ئێرەشم لەدەست چوو، وامزانی ساحێبی هەوارەکەی هاتیەوە».

بەگم بەهەناسەیەکی قوڵەوە: نانا، ئەتوو بەتۆفانی نووحیش لەمن دانابڕێی، مەگەر مردن لێکمان بکا، دەنا بچمە هەرجێیەکی دەبی لەگەرم بێی».

بەینا بەینیش عەلی رەزا دەردەکەوتەوەو هەواڵی گوندی بۆ بەگمێ دەهێناو پێش ئەوەی بڕواتەوە دەیگۆت: دەرێم قسەکی بکەم».

بەگم زوو تێی دەگەیشت و دەیگووت: عەلی پێدەچی ئاخیری ئەمن بتکوژم!، هەرچەندی سەر دەینم ودەبەم هەجەلت بەدەستێ من هاتیە!، ئەوجە چ جوابێ ئەوخوایەی دەدەیەوە؟ ئەوهەموو دزی و کەتنەت کردیە!».

عەلی بەخەندەیەکەوە: ئەدی ئەتوو کوو جوابێ ئەوخوایەیی دەدەیەوە؟ قونێ شێرۆی شەریفت هوردوهەڕاکرد؟!، کەس مارێ ئاغەی داخ نەکردیە ئەتوونەبی!، ئەخرئەمنیش لۆیە گرناگەم لەتوو گرتیە ئاوقوفین ئاوقووف».

هـەمووجارێ عـەلی دەهـات و قسـەوهەواڵی دەهێنـاو دواتـر بـەگم بەتووڕەیی دەیناردەوە، ماوەیەکی پێدەچوو دەهاتەوە!.
دووای نیوەڕۆیـەک بەهەشـتاوی هـات و خـۆی گەیانـدە بـەگمێ و بەنزمی پێی گووت: بەگم خەبەرەکم پێیە ئەگەرئاشکرابم سەرم تێدەچی، بەگێێ خۆم گێم لێ بوو جەوهەرئاغە زەلامان دەنێریتە ئێرە لۆ کوشتنت، پێدەچی باش دیقەتیان دابێتە ئێرە!، هەربزانە بەسەریان دادای،.
بەگم: عەلی راست و راستم پێ برێ ئەوخەبەرەت کوو زانی؟.
عـەلی: وەلاهـی ئـەوەی راسـتی بـی لـەمێژە شـەوان خۆدادەنووسـێنم سەمینۆفەکەی شێرۆی شەریفی بدزم، گەلەکم تەماحی تێدایە، حەزیشم لێیە کەپووی بشکێنم،.
بەگم قسەی پێ بڕی و: ئێ قوونی گەلەک جوانە هەرکەپووی مابوو!،.
عـەلی: ئـەوجا شـەوان ئەگەرمانگەشـەو نـەبی، وەکـی لـەمارێ ئاغـەی دێتـەوە سـایەدی دەکـەم!، لـەدووی دەچـم و خـۆم دادەنووسـێنم!، بەشـکو کەلێنەکم لۆببی!، دونێ شـەوێ لـەبن کوپپەی گێم بەدەلاقۆکەکەی وەنـابوو، جەلاتینەکـەش دڕابـوو دەنگیـان دەهـات!، گێم لـێ بـوو قسـەی لـۆ ژنەکـەی دەکـردو دەیگـۆ: بـەگم لـەئاقارێ گردەشـینەیە، بەتەماینـە شـەوەکێ بچینـە سـەری، جەوهەرئاغـە گـۆتیتی ئـەوجارە بەخۆشـم دێـم، ناچینـەوە هـەتا نەیکوژین،
بـەگم: ئـاااای عـەلی خواشـایەدە ئێشـت لـۆ جنۆکـەش نەهێشـتیتەوە!، دەرکە نیە سەرت پێدانەگردبی!،.
عـەلی: وەلاهـی بـەگم مێـردم پـێ بکـەی سـەرم بچـی نـوێژم نـاچی!، دووشەمان و پێنج شەمان بەرۆژی دەبم، دەبی بەیانیان وەکی مام سۆفی دێتە مزگەفتێ ئەمن چار رکاتە سوننەتیشم کردبی،.
بـەگم ئـەمجارە بەقسـەکانی عـەلی تـووڕە نـەبوو و بەنـەرمی سـەری لەبـەرەخۆی نایـەوەو پێـدەچوو بـڕوای هـاتبێ کەپێویسـتی بەپیاوێکـە،

ئاژەڵداری و هەوارهەوارو دوژمنداری ئاسان نیە !، عەلیش سەرەڕای دزیەکانی لەمێژبوو مەردومەردانە ببووە پارسەنگی بەگمێی لەبەرامبەر زولمی ئاغە.

بەگم بەدەنگێکی گران و سەنگین: عەلی جارێ برۆهەڕۆوە، خواکەریمە، ئەوماوەیەی دزی ومزییان مەکە، فکرەکی لێ دەکەمەوە، ئەگەر وابی پێت رازی دەبم و بزانم ناچینە کێستانێ، مادام هەوارێ بابم بەجێما ئێرەش هەربەکەلک نایێ.

عەلی گەڕایەوەو بەگم زۆر هەشیارتربوو لەجاران، شەوان نەدەنووست و هەردەمەو لەشوێنێک نۆبەتی دەگرت، زرێخ زوو دەنووست و بەیانیانیش زوو خەبەری دەبۆوەو مێگەل و شوانەکەیان بەڕێدەکرد، شەو و رۆژیان لەنێوانی خۆیان دابەش کردبوو، عەلی دەنگوبەنگی نەما !، دەبوو سەرێکی دەرکەوتبایە! لەوادەی خۆی دواکەوتبوو!، بەگم بێ خەبەربوو لەوەی عەلی لەگەڕانەوەیدا داروەدەستەی ئاغا دەیڕفێنن و لەکەندێ زیخماران دەیکوژن.

شەوان بەگم فانۆسەکەی هەڵدەکردو خۆشی لەدەرەوەی حەسارەکە چاوەدێری دەکرد، هەمیشە زەینی لەسەرئەو توولەڕێ و کەندوجۆمانە بوو کە گومانی هاتنیانی لێ دەکرد، کەدونیا رووناک دەبۆوە سەرخەوی دەشکاندو نۆبەتی رایی کردنی ئیشەکانی زریخێ دەهات.

ئێوارەیەک رۆژ ئاوابوو، بەگم خەریکی دەولک و کۆلان بوو لەناومەڕی، زریخیش لەبەرهەیوانێ باڵندەکانی خەیاڵی باڵەفرکەی رێگایەکی دووریان گرتبوو، لەسەرپیرە هەولێرێ ماڵ بەماڵ بەدوای سۆراغی کوڕە بێ سەروشوێنەکەیدا دەگەڕا، لەدەرگایی هەرمزگەوتێک سکاڵای لای خودا دەکرد، پرسیاری ئەو رۆژەی دەکرد کەبراکەی کۆرپەکەی لەباوەش دەڕفێنی و لەماڵی خودا جێی هێشتووە.

لەودەمانەی بەگم لەخەیاڵی مێگەل و زرێخ لەقووڵەخەمان، پێچەوانەی لێکدانەوەو گومانەکانی بەگم، پێنج هەسپ سواری تیژڕەو، لەدیوی قەرەچووغەوە گەیشتنە سەرحەساریێ و یەکەم فیشەک سنگی زرێخیان پێ شەق کرد، خوێنی پڕحەسرەتی چەند ساڵەیان تێکەڵی خۆڵ وخاک کرد، قەدەر کۆتایی بەمەینەتیەکانی هێنا، خەونەکانی بۆ تاهەتایە وون بوون، قەدەری زرێخ وابوو، نەیدەزانی گلەیی لەکەس بکا، هەموو نەهامەتیەکانی دابووە دەست چارەنووس، نەیدەزانی پیاو چ ئەژدیهایەکی خوێن مژو هەوەست بازە !، تا ئەوساتەی کرایە نیشانەی تیرو لەخوێنیش گلا، هەر پێی وابوو پیاو دەبێ لەدووای خودابێ!، ژن نانکەرو جل شۆرو خزمەتکاربێ!، پیاو هاواربکاو ژن یەکپێ و دەست لەسنگ بووەستێ، هەرکاتێک بیەوێ ژن دارکاری بکاو برسی بێ تیری بکا، پیاو دەتوانێ لەزەت بکا نەک ژن !، کلتوور زرێخی فێرکردبوو نان و سێبەرو باران و ژیان و ئۆقرە هی پیاوە، پیاو دەبێ هەموو شتێکی هەبێ !، مەڕو هەسپ و ژن !.

زرێخ چۆڕاوکی خوێنی لەبەرشۆڕبوونەوە، سوارەکان واتێگەیشتن بەگمیان کوشت، هێشتا نزیکتردەبوونەوەو بەفیشەک تەرمی زرێخیان دەکێڵا، بەگم لەناومێگەڵ خۆی خستە سەرچۆک و چاوی خستەسەر سێری تفەنگێ و یەکەم فیشەک سوارێکی فڕێدایە خوارێ، هەموو شڵەژان و واقیان وڕما!، نەیانزانی فیشەک لەکوێوە هات!، خێرا ویستیان خۆیان قوتارکەن، بەگم فیشەکێکی تری لێ خوڕی و لەبەینی قۆرنجی سوارێکی تری داو ئەویشی فڕێدایە خوارێ !، ئەوانی تر هەریەک بەلایەکدا بزربوون.

بەگم چووە سەر زرێخێ و بینی ڕۆحی هەڵفڕیوەو ئیتر ڕاکەڕاکە بەدوای نان و سێبەرناکاتەوە، نابێتەوە بەکچەکەو گۆزەکەی ناخاتەوە سەرشان و بەکچانی ئاوایی بڵێ داخوازیم هاتووە ودەبم بەماڵ، چیدی مەمکی پڕشیرنابنەوەو کۆرپەکەی لێ تێرتێربکا، ئیتر باڵندە ماندووەکانی ڕۆحی سکاڵا دەگەیەننە عەرشی خودا، خەمەکانی کەندێناوە دەباتە ئەوێ و

ورد ورد چیرۆک و بەسەرهاتەکانیان بۆ دەگێڕێتەوە، فریشتەکان بەجلە شرەکان دەیناسنەوە، کچانێ سەرکانی و بیری ئاوێ شایەتی بۆدەدەن، منارەی مزگەوتەکە دێتەگۆو منداڵەکەی بۆ دەهێنێتەوە، مەمکە پڕشیرەکانە دەخاتە دەم و برسیەتی ئەوهەموو زەمەنەی پێ دەشکێنێ، گۆرانی تاتی تاتی بۆدەڵێ و رەوڕەوەی بۆلەدارهەنار درووست دەکا، گەورەی دەکاو ژنی بۆدێنێ، کچێکی بۆدەخوازێ لەسەرکانی مزگێنی بداتە کیژوکاران، کەسیش هەناسەساردی نەکا.

بەگم چووە سەر هەسپ سوارەکەی یەکەم، بینی شێرۆی شەریفیەو جامی سەری هەڵتەکاوە، لەوەی دووهەم نزیک بۆوەو بینی کانەبیەو لەسەر لەپان دەخشی و برینـدارەو فیشەکێکی بەکلێنجەی کەوتووە، بەگم بەپێ وەریگێڕایەوە سەرپشت و پێی گووت: کانەبی زوو پێم گۆتی تیلاکت لەوخمەی وەرمەدە، خینی چت لەچاوی مەیە؟.

کانەبی بەنووسکەوە دەیویست بەگم بەزەیی پێی بێتەوە، بەگمیش لوولەی بڕنۆی لەسەر نیوچەوانی داناو تەقاندی، گۆزینگی هەردووکیانی بەگوریسێک لەهەسپێ خۆیان قایم کردو رەوانەی گوندی کردنەوە، هەسپ گەیشتەوە گوندی و مەیتی لەدووخۆی رادەکێشا.

خەڵکی گردەشینە هاتن و بەم شەوە زرێخیان ناشت، بەیانی بەگم پەرەوەڵەکانی لەوێ فرۆشتن و مێگەل و ماڵاتەکەی بەپێش خۆیداو لەزوورگەزراو بەسەرکەوت و ئاوڕێکی پڕتاسەوتامەزرۆی کەندێناوەی دایەوە، ئاوڕێک پڕبوو لەو وێنانەی کەلەبیرو زەینیدا مابوونەوە، کاتێک تازە خۆی ناسیبوو و ببووە جێی ئومێدی باوکی، فێری هەسپ سواری و قۆشمەو تفەنگانێ ی دەکرد، فێری ئاشەوانی و دەستبارو دەستگرتنی هەژارانی دەکرد، کاتێک تاعوون دەرگایی گوندەکەیانی لێ دەگرێ و ئازیزانی لەگەڵ خۆی دەبا، کەحەمەخان دێتەدەرگایان وبەنان و زگ دەبێتە

ئاشـەوان، زوو رەسـەنايەتی دەنـوێنێ و دەبێتـە خـۆری گەشـی و سـايەو سێبەرو سەرداری».

بەگم جڵەوی هەسپەکەی بەدەستەوەبوو ومێگەل ومالات وهەتا سەگە وەفادارەکانیش هاوسەفەری بوون بەرەوهەولێر، ئەوشـارەی بۆهەمووان دايکەو بۆهەمووان باوەش، ئەوشـارەی کەس بەمێوان نازانێ و هەمووانی خاوەن ماڵن، هەولێری سەخاوەت و دڵ گەورە، نامۆیی لەکەس ناکاو کەسی لا بێگانە نیە».

بەگم ئیتربەتەنیا مایەوە، نەپەرێزو دەغڵ ودان، نە کاوکادین، نەجۆو جـۆخین، نەحەسـارو کۆشـک وهـەیوان، ناچـار بەهەناسـە سـاردی مەڕومالاتەکـەی فرۆشـتن و وەک مرۆڤێکـی دووربـین، پارەکـەی بـەڕیزە دووکانێـک دەداو بـەکرێیان دەدا، سێبەرێکیشـی لـەنزیک پیـرە قـەلاتوکێ دەکـڕێ، تـا تەمـەن وسـاڵ گەیانـدبووی بـەمرۆژە، هێشـتاش لەخـەمی گەڕانەوەیـدابوو بۆکەنـدێناوەو نەیدەویسـت گۆڕەغەریبەیـەک ببێتـە هۆبەوهەواری، هەر رۆژێک کەدەژیا چاوی کزو نیگایی هەڵۆئاسایی وێڵی دەشتی گەنم ونان بوو، بەسەرهەنگاوەکانیدا گوزەری دەکردەوەو دەیگووت ئەگەر بەتەنێ نەمابام قەت هەوارێ بابم چۆل نەدەکرد».

شـکۆو تیپـەش گەڕانـەوە کارگـەو بوونـەوە هـاوڕێ وهـاودەمی مـام بڕهـان و ئـاگرو کـورەو فـافۆن، رۆژگـار لـەوێ لەباوەشـی خـۆی شاردبوونیەوە».

تیپە شـەوێکی درەنگی قۆزتـەوەو ملپێچـە سوورەکەی دیاریی مـاڵی شابازی لەگەڵ خۆی بردو لەملی فەرزانەی دولبەری کردو پێی گووت بەم زووانە دەبینە ماڵێک لەکوێستانان و خۆرت لـەوێ هەڵدێ، ئاسـۆت ئاسمانی ئـەوێ دەکاتـە تـابلۆی عـومرم، سـەفەرت دەچێتـە هـەناوم، سـەرچاوەت لەکانیاومەوە هەڵدەقوڵێ».

تیپە مـوژدەی سـەفەری لەمێژینـەی بەفەرزانـەی دولبـەری راگەیانـد، شــەوانیش درەنــگ کــە کارگــە دەکوژایــەوەو ئیشــەکانیان تــەواو دەبــوو، بەچپەچپ لـەدووایین نەخشـەو پلانیـان وردتتـر دەبوونـەوە، تیپە دەیویسـت پێش ئەوەی هەولێر جێبهێڵێ، داگیرکەران لەئاگری غەزەبی خۆی بسـووتێنی و پێیان بڵێ هەولێر پڕە لەشابازی لوتکەی کـەژان، پڕە لەبـەرزەفڕی سـەری دوندان، پڕە لەزامی رێی ئازادی، هەولێر پڕە لەمشتووی دەسـتەویەخە، تیپە لـەمێژبوو کوشـتنی والـی داگیرکـەرانی لـێ ببـووە شـاخەون، هەرچەند پێیان گوتبوو خۆت لەکارێکی وامەدە، بەلام سـەری نـەدەدا، تیپـە نەخشـەی هـەموو رێگاو کۆلانەکانی لەسەر لاپەڕەیەک درووست کردبوو، لەهـەموو ئەگـەرێک ورد دەبۆوە!، لەچ خالێک دەست پێ بکاو لـەچی کۆتـایی بێ، والـی لـەکوێوە دێت و چۆن دەچێتـە سـەرکارەکەی؟ چەنـد پاسـەوانی لەگەڵـەو کـام شـوێن باشترینە بۆ لێدانی؟، زۆربەی شـەوان قسـەیان لەسـەر نەخشـەوپیلانەکەبوو، جارجـاریش دەچوونـە لای دایەبـەگم وپـرس و رایـان پێـی دەکـرد، بـەگمیش قســەی خــۆی هــەبوو، ئــەویش پڕبــوو لەئــەزموون و هونــەری تەقــەکردن، دوواجــار گەیشــتنە خــاڵی هاوبــەش و بڕیاریانــدا والــی بەدەســتی کــوڕە هەولێریان ببێتە پەند..

کات و شوێن دیاری کران، شەو تیپەو شکۆ لـەماڵی دایەبـەگم مانـەوە، چـەک و تـەدارەک حـازرکران، بڕیـاری کۆتـایی دراو ئیتـر گۆڕانکـاری لـێ نـاکرێ، بـەیانی رۆژێکـی ساردوسـەرمابوو، هێشـتا شـەختەی شـەو مـابوو، دوورو نزیک لەیەکتری چاوەڕێی والی بوون، بەگم لەسەری کۆلانێک لـەژێر چارۆگـە رەشـەکەی میلـی تفەنگەکـەی هێنـابۆوە، تیپـەو شـکۆش لـەکۆلانێک ئەولاتر لەژێر چاکەتەکانیان تفەنگیان بەسنگیانەوە نابوو..

چــاوەڕێی هــاتنی والــی بــوون لەشــەقامە گشــتیەکە، کەهــەموو رۆژ پێیدادەهات..

کات تـەواو ببـوو، کـاروانی ئۆتومبێلـەکانی والـی لـەدوور دەرکـەوتن، بـەگم ئیشـارەتی بـۆ تیپـەو شـکۆ کـرد کـەئامادەبن، تـەواو لەیـەکتر نزیـک بوونـەوە، هەرسـێکیان لوولـەی تفەنگـەکانیان ئـاگری لـێ دەردەپـەڕی و هەناسەی رەشیان دەداوە، والی بوو نەنیشانەی تفەنگەکانیان، بەگم لەژێر بەلاپیلەکەیـەوە تـەنها لوولـەی تفەنگەکـەی هێنـابووەدەر، بەشـێوەیەک پێنەدەچوو کە پیرێژنێک تەقەبکا!!، سـەرەڕای تەققە کـردن لـەوالی و برینـدار کردنـی، کـەچی دۆخەکـە پێچەوانـە بـۆوەو باسـەوانەکانی والـی ئـەوناوەیان غـەرقی ئـاگرکردو دەیـان تفـەنگ کۆلانەکـەیـان راگێـڕا، تیپـە بـەپێوە بۆئەبـەد رۆحـی هـەڵفڕی، وەک باڵندەیـەکی کۆچـەری، تیـژ لەهـەورە بـەرزەکـانی دەڕوانی، بێ ئەوەی جارێکی تر ئاوڕلەکەندێناوەو بیرەوەریەکانی بداتـەوە، چەنـد پـەرۆش بـوو هاجـەرەی خوشـکی ببینێتـەوەو پێـی بڵـێ لـێم بـوورە کەنەمتوانی لەمەراسیمی خەونی عومرت پڕبەگەرووم پێت بڵێم پیرۆزە، لێم ببوورە شەوی زێڕینی بوکێنیت وەک گوڵشەنی غەمگین نـاموراد بـوو، وەک چڵـە رێواسـێکی کوێسـتان لـەبیابانی خـەتا بـوو، وەک کارمـامزێکی بنـاران ئێوارەیەک راوکرابوو، خەونەکانی تیپە بوونە سەراب، قـەلای هۆلاکۆ بـەزێن بـەدیار لاشـەی ساردوسـڕی خـوێن چـۆڕاوی دڵ شـکاوی کـوڕەلاوێکی کەندێناوە دۆشدامابوو، ماتەمی خۆی بۆپیرە سەفینێ دەنارد.

شکۆش بەهەناوی پڕخوێن و ئەژنۆی شکاو هێشتا خوێنی گەرم بوو، گـەڕەک لەترسـی تەققـە دەرگاکانیـان داخسـتبوو! دەیویسـت بگاتـەوە مـاڵی دایەبەگم، دووربوو بەڵام هێزو وەرەی دەدایەخۆی وخۆی نەدەدایە دەست قـەدەر، بـەگمیش دوورو نزیـک هـانی دەدا، جارجـار لەپێشـی و جارجـاریش لەدوواوەی دەڕۆیشت، نەبادا زەفـەری پـێ ببـەن، تـا گەیشـتنەوە مـاڵی بـەگم، شکۆ تەواو بێ هێزببوو.

هەنـدەی نـەبرد داروبـەردو شـەقام و رێ تـەژی ببـوون لـەچەکداری داگیرکەران، هـەموو شـوێنێک دەگـەڕان، هـەموو شـتێکیان دەپشـکنی، سـەدان

کەسیان راپێچی بەندیخانە دەکرد، هەواڵی برینداربوونی والی هەموو دونیایی تەنی، لەرادیۆکان هاواری دەکرد شۆڕشگێڕانی کورد لەهەوڵی کوشتنی والی سەرنەکەوتن، کوردەکان داگیرکاری قەبوڵ ناکەن و دەستبەرداری خاکیان نابن تانشتیمانیان ئازاد نەبێ.

شکۆ کەچاوەکانی کردەوە هێشتا دونیا رۆشن نەبوو، هێشتا لەبیری نەبوو بەدوایی ئاوازی چ باڵندەیەک هاتۆتە ئەوشارە؟، بەدووای سیبەری چ درەختێکەوە هاتبوو؟، لەبیری نەبوو لەدەرگای چ میوانسەرایەکی دابوو؟، چ بایەک هەڵیفڕاندبووە ئێرە ؟ دەنگێکی ناسک ونەرم بەبەگمی دەگووت: برینەکانیم خاوێن کردەوە، خینەکەشیم راگرتیە، تازە وائێوارەیە، بەرام سبەی هەرکوەکی بی خینی لۆ پەیدا دەکەم، لەخەستەخانەی زۆرە بەرام دەبی بشارمەوە، هەوکە دەڕۆم سبەینێ زوو پێشی بچمە دەوامێ سەری لێدەدەمەوە، لۆ نێوڕانێش عیلاج و دەرمان و هەمووشتەکی لۆدەینم.

شکۆ تەنها لاشەی ساردوسڕو سووکە هەناسەیەکی نەرمی لەماڵی دایەبەگم مابوو، جارجار نیوە پێڵووی چاوەکانی دەکردنەوەو بەگمیش بەنەرمی: شکۆ، شکۆ، باشتربووی؟.

چاوەکانی دادەخستنەوەو هیوا وەک خۆرێکی کزی نیوەئاوابوو لەڕێگایی دووری سەفەری رۆحی دەچوو، نەدەنگ و رەنگ نەخەو نەخەیاڵ، کەلێنی پەنجەکانی سووربوون بەخوینی ئاڵ، باڵندە غەریبەکانی رۆحی هەڵترووشکابوون، نەدەچوونە کەندێناوە هەواڵی گۆڕستان و باخچەو خوشکەکانی بۆ بێننەوە.

شرونقەیەک پێڵووی چاوەکانی پێ هەڵێنان، بەلام هێشتا وێنەکان روون نەببوون، گوێی لێ بوو دەیگووت: بەئاسانی لەخوێنی خۆییم بەدەست کەت، دەرمان و شرووقەی باشیشم هینایە، بەرام هەردەبی بگاتە خەستەخانەکی.

بەگم: جوابم لۆناردینە، گۆتیان دختۆری خۆمان هەیە.

بەیانیەکی پڕئومێد دیسان شرووقەیەک لەسەرپشتی دەستی چاوەکانی پێ کردنەوە، ئەمجارە وێنەکان جوانتر لەجاران خۆی دەرخستبوو، کچێک برۆیەکانی دەستکاری نەکرابوون، بەوردی لەشرووقەکەو پشتەدەستی رادەما، پرچی رەشی قەترانی شۆڕببوونەوە.

+ شکۆ دەمناسی؟.

شکۆ بەبێتاقەتی: نا.

+ دەنا ئەمن لەمێژە دەتناسم، چاببیەوە دەچینە ماری مە، ئەگەر ئەمنت بوێ مێردت پێ دەکەم، ئەمنت دەوێ ؟.

شکۆ بەبێتاقەتی: ئا، ئەتوو کێی؟.

+ ئەمن دکتۆرم چاکت دەکەمەوە، خۆلەبیرم ناکەی؟.

رۆژانێکی کورت بەسەرچوون.

دووای شرووقەیەکی پشتەدەست: شکۆ ئێستا چۆنی؟

شکۆ: باشترم، ئەتوو کێی ؟

+ لۆ دەتەوێ بمناسی؟ ئەمنت دەوێ ؟ کەچاک بوویەوە بەمن رازی دەبی؟، ئەمن حەزدەکەم مێرد بەپێشمەرگەیەک بکەم و بچینە دەرەوەی دەستەلاتی داگیرکەران.

شکۆ: ئەخەر پێم برێ ئەتوو ئەمن دەناسی؟.

+ وەکی لەگەر تیپەی چوویە دۆلی بالیسانێ، هێوارەکێ کێ بوو قسەی لۆتان کردو پێتانی گۆت تەققەی لەوالی مەکەن هەتا بەخۆمان پێتان دەرێین؟.

شکۆ: ئا، دەیناسم، سەرلقی کەندێناوەبوو، ئەو بابمی دەناسی.

+ ئەوە برام بوو، جوابمان لۆی ناردیە دێتە دووت و دەتبەنە دەرەوەی ولات، هەتا تەواو چارەسەری وەردەگری، بس ئەمن لەبیرنەکەی، بچی لەدەرەوە کچەکی لەمن جوانتر بینی، دوایێ بتبینمەوە بەژنەکەت دەلێم ئەو کوڕە ئەمنی خۆش دەویست.

شکۆ بەخەندەیەکی خونچەیی: نانا، بەخوای ئەتووم دەوێ..

+ باوەڕت پێ دەکەم چونکە خەڵکی دەشتێ زۆرساحیب پەیمانن، ئەمنیش مێردی ناکەم هەتا دێیەوە..

تەندرووستی شکۆ بەرەوباشی دەچوو، کچە برین پێچەکەش رۆژانە سەری لێدەداو جگە لەچارەسەرو شروونقە، پڕی دەکرد لەهیواو بڕوا بەخۆبوون، هێزی هەڵسانەوەو ئومێدی پێ دەبەخشی، دەیویست جگە لەداو و دەرمان، ئەوینی کچێک برینەکانی سارێژبکا، بێ خەبەر لەوەی کەئەوین خۆی برینێکی قووڵترە، چۆن ئاگر بەئاگر دەکوژێتەوە!؟، شکۆیەک پڕلەباڵندەی کۆچەری، پڕلەزام و بیرەوەری و سووتان، رەهاوخاڵی لەمانگ و تریفە، لەبزەی لێو و تیشکی چاو، پڕ لەهەنگاوی بەجێماو، چۆن دەوتوانێ کچێک لەبیرخۆی باتەوە، هەم تیروهەم نەشتەری بووبێ !، چۆن دەتوانێ جگە لەدوژمن عیشقیش گەمارۆی بدا ؟!،

هێدی هێدی کچێک دەیویست ببیتە دووایین مەرهەم، دووایین درەخت کەسوێندی پێ بخۆن، دووایین شاری نوێژو مزگەوت و تۆبە، دووایین زەردەخەنە کەئێوارەیەک بێتەوە، دوایین نان دووایین مرۆڤ دووایین گوڵ وباران و باغ و ئەستێرە..

رۆژانە دووسێ جار دەهات و دووای دەرمان و شرونقە، کۆرسی عیشق و بەڵین و وەفای بۆ دەگوتەوە، ئازارو نشتیمانی لەبیردەبردەوەو خۆی دەبوو بەداگیرکەری ولاتی و سرروودی خۆی تیادا دەگوتنەوە، سەرگوزشتەی نوێترین خۆشەویستی تۆماردەکرد، شکۆ تینووی ولات و کێلگەی برین بوو، ئەویش بەتیلەی نیگایێ سەرنجێکی پڕتامەزرۆی خۆیی دەدایێ، جارجارەش ماکیاژی لێوەکان و خوێنە رەقبۆوەکەی برین، تێکەڵ دەبوون، قسەو دووانی پێ دەبڕین..

دانەئێوارەیەک هەنگاوەکانی لەرۆژانی پیشووترجیابوو!، خەندەکانی هەواڵێکی کوت وپڕیان لێ بەدی دەکرا، دووای هەواڵ پرسین

لەتەندرووستی، موژدەی سەفەری شکۆی پێبوو، هاوڕێکانی شاخ هاتوون و شـەو دەیگوازنـەوە ناوچـەیی ئـازادکراو و لـەوێش بـۆ دەرەوەی وڵات و چارەسەری تەواو و بنبڕکردنێ.

بەگمی پڕئەزموون هات وچوو، خێرا نوێنی گەرم وپێخەفی نەرمی ڕێگـەی دووری بـۆ حـازرکرد، کـۆڵانیش پێـدەچوو ئامادەکـاری زۆری بۆکرابێ!، لەئێوارەوە ئەوناوە لەژێرچاوەدێریدابوو.

شـەو هێشـتا کرێکـار نەحەسـابوونەوە و منـداڵ نەخـەوتبوون، ئوتوومبێلێک بەهێواشی دەهات وکۆڵانەکەی رووناک کردبۆوە،

لەپیش ماڵی بەگم وەستاو شوفێرەکە دانەبەزی و دوانەکەی تریش بەهێواشی شکۆیان گەیاندە دوواوەی ئوتومبێلەکەو ڕۆیشتن.

شکۆ لەدووایین نیگاکانیدا چاوی بڕیبووە دایە بەگم و ئەوکچە فریاد رەسـەی کـەجگـە لەشـرووقەکان، دەمارەکانیشـی پڕکردبـوون لەعیشـق، دەیویست پێیان بڵێ ئەگەر چاک بوومەوەو نەمردم دەگەڕێمەوە لاتان.

شکۆ لـەمێژبوو لەگەڵ کاروانـەکان دەڕۆیشت و هـەموو شتێکی جێ دەهێشت، دڵـی پڕبـوو لەهـەڵفڕین، لـەنیگایی کـۆتری بـێ هیلانـە، لەڕێژنـەی لەناکاو، لەئەستێرەی دوور، هێشتا نەیدەزانی ئەمجارە لەکوێ دەگیرسێتەوە، بەدرێژایی شەو لەڕێگابوون، هەندێک جار کەندوکۆسپ و هەندێک جاریش ڕێگایەکی ئارام، بەیانی لەگەڵ تاریک و روون، باعـەی مـەڕو بۆڕەی گاو قووقـەی تیـژی کەڵـەباب مـوژدەی گونـدێکی ئاسـوودەی چەپـەک و دوورەدەستی پێدان، قرقرەی مێگەل باڵندەکانی ناخی شکۆی هەڵدەفڕاندەوە کەندێناوە، هەندەی نـەبرد شکۆیان بـەپیاوێک سپارد، لەبەرسـەختی ڕێگاکە ئـەو دەتـوانێ بەتراکتۆروعەرەبانەکـەی شـکۆ بگەیەنێتـە شـوێنی مەبەسـت، ڕێگاکان سـەخت و بـەردەلان بـوو! بـەلام ئەوەندە شـارەزابوو بەرلـەرۆژئاوا شکۆی گەیاندە میوانسەرای بالیسانێ و گوندی تووتمێ، دووای چارەسەری نەخۆشخانەی شۆڕش، بڕیاردرا بەیانی بنێردرێتە ئەودیوو سنوور.

شكۆ گەیشتە نەخۆشخانەو مانەوەی زۆری دەویست.

نەشتەرگەری و بێ هۆش بوون ساڵ ومانگ و رۆژی لەبیربردبوونەوە، جارجارەش کەباڵندەکانی زەینی، وێنەیەکی کەندێناوەیان نیشان دەدایەوە، لەدڵەوە دەیگووت: ئەی بارانی مەفتەنم ئەگەر لەوغەریبیەدا مردم و نەمتوانی بێمەوە جارێکی ترلەگەرت بگریم لێم ببوورە.

ئەی نێرگزی بسک زەردی باخچەکەمان ئەگەر لەهەندەران مردم و نەمتوانی بێمەوە لەبەرپێت بنووشتێمەوە لێم ببوورە.

ئەی دایکە رەشپۆشەکەم ئەگەر لەوغەریبیەدا مردم و نەمتوانی بێمەوە سەر گۆڕەکەت پڕبەدڵی خۆم بگریم، لێم ببوورە.

خەرمان و شیلان و چنار، خوشکە بێنازەکانم ئێوەم بەتەنیا جێهێشت و هەناسەساردم کردن، لێم ببوورن ئەگەر نەمتوانی بێمەوە.

زۆری نەبرد راپەڕینێکی سەرتاسەری باشووری کوردستان وهەولێری گرتەوە، کرێکاران و جوتیاران و مامۆستاو منداڵ و پیرولاو و ژن، راپەڕین وعەرشی داگیرکاریان هەژاند، شۆڕش و پێشمەرگەو تفەنگ خۆیان گەیاندە جەماوەرو شار یەکپارچە بوو بەپۆلی ئاگر بەرووی داگیرکەراندا، لافاوی رقی گەلی چەوساوە و قریوەی جەنگ و جۆشی لاوان، بەهاری جوانترو قەلای بەرزترکردبوو، کۆگایی چەکی داگیرکەران کەوتە دەست هەولێریان و دوژمن و داگیرکەرانیان دەرپەڕاند، کامە کۆشکی داگیرکاری بەرزتربوو ئاڵای کوردستانی لەسەردەشەکایەوە، بتی داگیرکاری رماو هەندەی نەبرد شار بۆنی کوڕانی خۆی گرتەوە، لاوان لەخوێندن میژووی خۆیان خوێندەوە، ژنان هاتنەدەرو لەگەڵ پیاوان مشووری ئاوەدانی و ئاسوودەییان بوو، زیندانەکان کرانە باخچەوباغ و گوڵستان، زەماوەندی ئازادی شەقامەکانی هەولێری پڕکردبوو لەخەندەی نێرگزوگوڵەباغ، ترس و تۆقاندن و سێدارە بوونە چیرۆک و بەسەرهات، سرانەوە فرمێسکی دایکە شەهیدو ئاسوودە بوون کچانی چاوەڕێی وڵات،

هەولێر بەرگێکی نوێی پۆشی و قەڵا بۆوە بەدەستگیرانی سەفین، کۆڵێژ پڕبوو لەکچانی ژیرو رەشبەڵەک دەستگیرانەوە، دێهات و گوندە چەپەکەکان ئاوەدان بوونەوەو کیژە کورد دەست وبرد ناندینیان گەرم کردەوە، مێگەل گەڕانەوە هەوێزان و ئاخوڕو کۆل پڕبوونەوە لەئالیک و ئاو، بێری دەرگای حەساریان کردەوەو شوان بەقریوەی بەیانیان رۆیشتن بەرەو بناران، کۆتر دەلاقەی خانووە قوڕەکانییان کردەوە بەهێلانەو سروودی نیشتمانیان لێ گوتەوە..

هەواڵی هەناسەی ئازادی هەولێرو باشووری وڵات گەیشتە شکۆی پەرگەندەو ئاوارەی دوورە وڵات، خێرا خێرا، خۆی پێچایەوەو بۆنی هەولێرو کەندێناوە ئۆقرەی لێ بڕیبوون، دەیویست باڵ بگرێ ولەسەر پیرە هەولێر بنیشێتەوە، چاوی برسیی لەشەقامەکانی هەولێربوو، شەیدای بینینی ئاڵاو قەلابوو لەباوەشی یەک..

دەگەیشتە هەرئاوەدانیەک پرسیاری شاخەونە مەزنەکەی دەکردەوە!، ئەرێ هەولیر ئازادەو دوژمنی تێدانەمایە؟

+ هاهووو، ماتوو لەکێندەربووی؟، دوژمن لەچ عەردان نماینەو گەڕانەوە وراتێ خۆیان، ئەوجا نزانم تەمبێ بوونە یان شەڕانمان پێ بەفرۆشنەوە!..

کێشتانەیەک گەیشتەوە هەولێر، هەمووشتێک گۆڕابوو!، ئازادی و خۆسەری سیمایی خەڵکی لەترس و تۆقاندن و دڵەڕاوکێ داماڵیبوو، چاوەکان هێشتا تینووتیان نەشکاو لەراموو‌سانی نیگایی یەکتری، هێشتا پڕبوون لەقسەوباس و چیرۆکی تاڵی ژێردەستەیی، بەشەوق و زەوقەوە جلی رەسەنیان لەبەردەکرد، شکۆ نەیدەزانی لەکوێوە دەست پێ بکا؟، دوواجار کۆڵانە کۆن و دێرینەکەی ماڵی دایە بەگمی کرد بەیەکەمین وێستگەی، وێنەکان دووبارە دەبوونەوە، کۆترەکانی سەرماڵی فەرزانە لەسەرکاریتە غەمگینەکان مەست مەست باڵیان بەیەکدابوو، دەرگا ژەنگاویەکەی حەوشە رەنگەکانی کاڵتربووبوونەوەو چاوەکانیان داخستبوو،

دیواروقاندرمــە ســواوەکە دەیــان نهێنــی و چیرۆکــی عەشــقیان لەناخــدا حەشـاردابوو، تیپە بەئومێد بوو لـەوێ دەستی فەرزانە بگرێ و پەپوولـەی شادی هەڵفڕێنن.

شکۆ بەهێواشی دەرگایی ماڵی دایە بەگمی کوتا، هیچ دەنگێک نەبوو!، جگە لـەفڕینی دوو کوکوختی پیر، لـە دوو دیوانی شیعری دێرین دەچوون تۆزیان لەسەرکەوتبێ، لەگەڵای چڵە درەختێک دەچوون باپز دەستی پێیان نەگەیشتبێ، دووبارە لەدەرگاکەی دایەوە.

دەنگی دایەبەگم لەودیو دەرگاکە: شکۆ دیارە ئێرە پێدەزانیەوە؟،

سیخەی شیشی دەرگاکە هات و شکۆ خۆی بەباوەشی داداو فرمێسک بـێ سـڵاو و بـێ پـرس و لـەدەرگادان، وەک جۆگەلەیـەکی نـەفام هەریـەک بەلایەکدا شۆڕبوونەوە، دایەبـەگم پشتە دەستەکانی چورچ و لۆچ ببوون و کەمێکیش پشتی چەمابوونەوە، بەڵام هێشتا زەین و چاو و دەنگە دلێرەکەی پڕبوون لەئایندەو ئومید، یادکردنـەوەی تیپە کـەمێک بێدەنگی کـردو دوواتر گووتی: گەلـەکم پـێ گۆت کـورە لەکـەلی شـەیتانی وەرەخـوارێ، واز لـەوالی بینـە، بەقســەی نـەکردم، نـاعیلاج گۆتم باهــەر لەگـەری بچـم، ئەوجـە خیری تێدابووهاتم، دیتت ئەتووش کوبەهیلاک چووی؟، خواخێری پەخشـانێ کیژێ ئەحمەدە کەچەری بنووسی ئەونەبایە هەر دەمودەست تەواو دەبووی.

شکۆ: نازانی لەکێندەرە؟ حەزم لێیە بیبینمەوە.

بــەگم: لەخەســتەخانەی رزگاریــە، ئــەلعان گــەورەش کرایــە، لۆنــاچی سەرەکی لێدەی؟.

شکۆ لەناخەوە گەلەک منەتباری ئەوکچەی بوو، دەیویست بیبینێتـەوەو بەڵێنەکانیشی بەبیربهێنێتەوە.

یەک یەک سەری بەژوورەکانی نەخۆشخانەدادەگرت، دیاربوو شارەزا نــەبوو، ناچــار لەدەرگایــەک پرســیاری پەخشــانی کــردو پێیــان نیشــاندا، لەدەرگایداو فەرمووی لێکرا.

دووای لەیەکتر رامان هیچ ووشەیەک نەبوو بیکەنە سەرەتا !،

هێشتا واقیان وڕمابوو و تەنها هەناسەیان دەهاتوو دەچوو!،

شکۆ بەچاوی لەرزۆک وپڕئاوەوە: دەمناسیەوە؟،.

پەخشان: فەرموودانیشە، ئەدی کوو ناتناسمەوە هەی ماری قەرپ، چما ئەتووهێشتا مای ؟،.

دووای هەوال و پرسیار، شکۆ قسەکانی ئەوکاتی بەبیرهێنایەوە، بەلام بەخشان باسی برینەسەختەکانی ئەوکاتی بۆکردوو پێی گووت من تەنها ویستم بەقسەوباسی عیشق ئازاری برینەکانت کەمکەمەوەو هێزو بڕواو ئیرادەت پێ بدەم، من دەمویست حەزی ژیانت پێ ببەخشم و مردن لەخەیاڵت دوورخەمەوە، رەنگە من ئەوقسانەم بۆنەخۆشی تریش گووتبێ، بەڵام پیم باشە سەردانی کاکەم سروود بکەی، دڵنیام ئەویش چاوەڕیتە، زۆر باست دەکا، هەها لەبیرتە وەکی لەگەرتیپەی یەکەم جار قسەی بۆکردن لەتووتمێ؟،.

شکۆ ناونیشانی ئەوێشی وەرگرت کەجاران لەژووری بارەگایەکی خشت و قوڕی سەربەکاریتەبوو، مشک جریت وفریتانێیان تێدادەکرد، بەڵام ئێستا لەکۆشک وباڵەخانەیەکی بەرزو پڕئوتومبێلە، شکۆیان لەهۆڵی پرسگەیەکی درێژ دانیشاندو پێیان گووت دەبێ چاوەڕێ بکەی، دیاربوو زۆری تریش چاوەڕێی دیداری بوون،

یەکێک لەبەرچاوی شکۆغەریب نەبوو!!، هەستی دەکرد لەشوێنێک بینیویەتی و گوێی لەودەنگەبووە؟! ئەوقسەی بۆیان دەکرد تاگەیشتە ئەوەی گووتی: برادەران ئەو رۆژانە بەهاسانی نەهاتنە، من بووم بەعارەبانەی شیلمێ لەگەر دوو برادەرێ خۆ لەبەر مەکتەبێ دەستڕێژمان لە (سعدخفاش) ێ کردو کوشتمان،.

شکۆ بەبیری هاتەوە، ئەوەخۆ شێلم فرۆشەکەیە ئەوەی وەعدی عارەبانەکەم پیدابوو و لەگەر تەققەی یەکەم راپەڕی و عەرەبانەکەی خۆشی بەجێهێشت !،.

توومەزخۆی کردبوو بەشکۆو چالاکیەکەی بۆخۆی دەگێڕایەوە،.

شکۆ دەرگایی ژووری بەرپرسەکەی لێ کرایەوەو دووای قسەوباس دیاربوو شار زۆرشتی گۆڕی بوون!، هەموو ببوونە خاوەن سەروەری!، هەموو ببوونە تێکۆشەر!، کەس مرۆڤە خۆنەویستەکانی نەدەناسینەوە!، ئەوانەی مردنیان هەلبژاردبوو و قەدەرهێشتبوونیەوە، بزرببوونە نێو گۆمی لیلی بیرەوەری!، کەس نەیدەزانی کێ تەققەی لەوالی کردبوو و کێ زەبری لەداگیرکەران دەوەشاند!؟، هەموو دەیانگووت من بووم، چیرۆکی درۆ و راستەقینە لەیەک جیانەدەکرایەوە!، ئەوەی بەگرانەتاش مردبوو لەخوێناوی شەرێکی دەستەویەخەیان وەردەدا!، کەس نەیدەزانی کێ لەسەرجێگایەکی گەرم مردووەو کێش بەپێوە رۆحی فڕیوە!،

شکۆ بیری مام برهانی کردەوەو دەرگایی کارگەی فافۆنەکەی راهەژاند، ئەوانی پێشتر نەبینی بوو!،

دوای سلاو، پرسیار: ئەدی مام برهان؟ لێرە ئیشی دەکرد، نازانن لەکێندەرە؟،

+ هاهووووو، ئەتوو لەکێندەربووی برا؟ مام برهان حەفت زەمانە مردیە، کوورە ئاگری گرت و مام برهان سووتاو دەلعاجی مرد.

شکۆ سەرێکی بەیادوبیرەوەریەکانی راگێڕاو ئەوشەوە درەنگەی بیرهاتەوە کەلەترسی سەرخۆشەکە هەلەتەببوو، کە مام برهان دەرگایی لێ کردەوەو هێنایە ژووری، بەیانیش بەشەهابی گووت و لای خۆیان دایمەزراند، شەوان درەنگ ئامۆژگاری دەکردن و وەک باوکێک بەوردی رێگەی ئایندەی بۆدادەنان.

شکۆ بیری هەمووانی دەکرد، لەمیوانسەرای بیرەوەریەکانی دەداو لەپەنجەرەی هەمووان رادەما، رێگەی مالی پەیمانی گرت، ژیان فێری کردبوو ئەوجارە خۆی لێیان نەشاریتەوەو بێ دوودلی بچێتە باوەشی پەیمان، باوەشی ئەودایکە مەزنەی چەند پەرۆش بوو بۆگەورەبوونی وهەلسانەوەی.

دەمێگ گەڕا تادەرگاکەی ناسیەوە، فرمێسکەکانی کولەکولیان بوو،

+ فەرموو کاکە تۆکێ ی ؟.

_ ئەمن شکۆم، دەمەوێ مامۆستا پەیمان ببینم، ئەو دەمناسی ئەگەر لیرەبی.

+ ناوەلا لێرە نیە، لەماڵی خۆیتی.

شکۆ: ئەگەر نامەکی لۆبنووسم دەگاتە دەستی؟.

+ بەڵێ، ئیستا کاغەزت لۆدینم بنووسە.

مامۆستا پەیمان ئەمن شکۆم، وەکی مامۆستابووی لەگوندی، لەکەندێناوەی، داکم مردبوو وئەتوو ببوویە داکم، هەموو رۆژێ ئاگات لێم دەبوو، جلکت لۆدەکریم و دەتشووشتم و خاوێنت دەکردمەوە، دوایێ حەزت لێبوو بخینم و ببمە مامۆستا، ئەمن لۆیە نەهاتمەوەو خۆم شاردەوە چونکە ساقیت ببووم، ئەلعان گەورەبوویمەو دەمەوێ بگەڕێمەوە کەندێناوەی، حەزم لێبوو بتبینم ئەوجە بڕۆمەوە.

شکۆ ئێوارە گەڕایەوە لای دایە بەگم و قسەوباس و رازونیاز هاتن وچوون، بەگم هێشتا چاوەکانی ماکی ئەوینی کەندێناوەیان پێوەمابوو، حەزی دەکرد بگەڕێتەوەو سەرلەنوێ هەواری کۆن ئاوەدان بکاتەوە، بڕیاریاندا پێکەوە بگەڕێنەوەو کۆنەمەفتەن و کۆشک و حەسارەکەی مەحموودئاشەوان سەرلەنوێ بکەنەوە بەنشتیمان، بەگم خانوو و دووکانەکانی فرۆشت و بارگەی یەکجارەکی بەرەوکەندێناوە تێکنایەوە، دراوسێکانی کۆبوونەوەو هاتن بۆدوادیدەنی، فەرزانە ملپیچە سوورەکەی تیپەی لەمل بوو، وەک رێبوارێکی ماندووی کاروانی غەم، رۆحی شەکەت، چاوەکانی داگیرسابوون وەکو مۆم، هێشتا دووا وێنەی تیپەیان پێوەمابوو، پڕبوون لەپەیمان وسەدان بەڵێنی بۆیەک بوون، پڕبوو لەساتی ئەوین و سووتانی شەوانی جاران، فەرزانە هاتبووە دوا دیدەنی بەگم تا پێی بڵێ: چەند حەزدەکەم تەنیاجارێک هەناسەیەکی قووڵی کەندێناوەی تیپە هەڵمژم و پیاسەیەک بەجێ پێیەکانیدا دابکەم، کەمێک لەهەورەکان رابمێنم و بارانی ئەوێ تەڕم بکاو فرمێسکانم بشواتەوە، تێرلەباڵندەکان بڕوانم و ئەوبازمەم

باز لەگەلیان بنیشمەوە، کەمێک لەوبنارە بمێنمەوەو لەهەرکەوەکانی تیپە تێرتێر تینوێتیم بشکێنم، من دڵنیام ئێستا رۆحی تیپە وا لەوێیە، لەگەڵ کۆترەکان دەفڕێ و دەنیشێتەوە، هەموویان دەناسمەوە، شەقەی باڵیان پڕە لەناوی تیپە، سروودەکان لەناوی ئەوەوە دەست پێ دەکاو لەناوی ئەویشەوە کۆتاییان پێدێتەوە، ئەدرەسی هێلانەکانیان شەقامەکانیان ناوی ئەوە، من دڵنیام کەندیناوەش ئێستا ناوی خۆی گۆڕیوەو دەڵی بانگم بکەن تیپە، سنگی شەقی قەرەچووغیش بکەیتەوە برین و زامی ئەوی پێوەیە، هەرچی گوڵەنیسان هەیە ئەوبەهارە هەناوی پڕلەخوێن بووەو برینداره».

بەگم لەهەناوی کەندیناوە دەستێکی خستەبەرچاوی، وێنەکانی ئەوساکە نەمابوون، خانووەکان کەوتبوونە ژێر خۆڵ و لەگەڵ زەوی ببوونە یەک، ئاسەواری ئاشەکە تەنها پارچە ئاسنێکی ساردی رەززا قورسی ژەنگاوی بوو، جارجار باڵندەیەک لەسەری دەنیشتەوە، سروودێکی دەگوتەوەو لەشەقەی باڵی دەدایەوە، کۆشکە قایم و دیوارە مەشکانیەکەی تەنها رەگی مابوون، جگە لەهەواری جەوهەرئاغە هێشتا کەس نەگەڕابۆوە، لەجێگەی کۆشکی تفەنگ و تەدارەک ونۆبەداری جەوهەرئاغەش خانووێکی نوێی ئاسوودەو باغێکی بەپەرژینی پڕباڵندەی ئێسک سووک، پڕ بوو لەسەمایی پەپوولە، جۆلانەیەکی درێژ، چەند کورسی ومێزێک لەدەورەی بوون، پێنەدەچوو کەسی تێدابێ !».

بەگم بۆشکۆ: ئەومارە نابی لێمان نێزیک ببنەوە بەقراری قەتعی، دەبی دەستوتفەنگیشمان حازربی، نەوەک تەقەمان لێ بکەن».

شکۆ: دایە بەگم ناوێ خوای بێنە، ئەتوو چل سارە ئێرەت بەجێهێشتیە، کێ دەرێ کەسیان ماینە!؟، دوایی ئەو زەمانە گۆڕایە،

لەجێ هەواری ئاشەوانێ بناغەی خانووێکی تازە هەڵکەندرایەوە، وەستاو کرێکارهاتن و دیواریان هەڵچنی، بەگم بەینابەین لەبەرەخۆی دەیگووت: حەزم لییە هەتا دەمرم لەهەواری خۆم بم».

چ مەعتەلی هەولێرێ نیمە قەبرم لەوی بی، داکم بابم خوشکم! کێم هەیە لەوێ؟.

پێنج شەممان خانووی ماڵی جەوهەرئاغە ئاوەدان دەبوو و پڕدەبوو لەکوڕوکچی جوان و قەشەنگ، جارجاریش دەنگ وناڵەی مۆسیقا و زرمەوهاواری دەف چێژوهەستێکی تری بەژیان دەبەخشی.

هەوارو خانووی تازەی بەگم باڵای تەواو هەڵچووبووە ئاسمان، پێنج شەممەیەک کوڕوکچەکانی هەواری ئاغە بەکۆمەڵ هاتن و بەرویەکی گەشەوە بەخێرهاتنی شکۆیان کردو پیرۆزبایی گەڕانەوەیان لێ کردن.

+ ماندینەبن وبەخێربێنەوە، بەڕاستی حەزمان لێبوو ئێرە ئاوەدان بکرێتەوەو خەڵک بگەڕینەوە، ئەمە لەمێژە بەتەنێینە، بیزاربووین، هەرچەند ئەمە پێنج شەممان دێین دوو ڕۆژ لێرە دەبین و دەچینەوە هەولێرێ، هەموو ئیش وکارمان لەوییە بەرام حەزمان لێبوو ئێرە قەرەبارغ بێتەوە.

شکۆ: خێراندارین، وەلا ئەمە بەیەکجاری لێرە دەبین، چ ئیش و کاری دیکەمان نیە و رەنگە حەسارەکی بکەین و پەرەوەرو هەندۆکەک ماراتی بەخێوبکەین.

+ گەلەکمان پێ خۆش بوو، هەرچیەکیشت پیویستە بەسەرچاو، ئەگەر ئەمەش لێرە نەبووین چت ویست بڕۆبیە.

ئەوان ڕۆیشتن و بەگم لەشکۆی دووبارە کردەوە: زۆر وریایی خۆتبە ئەوانە دەتکوژن، ماری پێ لەزگن، نەئەوان لەخینێ خۆیان خۆش دەبن نەئەمەش.

ئەوان پێنج شەممان دەهاتن و گەمەو یاری و تۆپانێیان دەکرد، هەندێکیان دەسگیراندارو و ژن و مێردبوون، هەر سێ چوارەک بەئۆتومبێلەک دەهاتن، جارجار لەدوورەوە بانگی شکۆیان دەکرد یاری و تۆپانێیان لەگەڵ بکات، بەلام لەترسی قسەکانی دایەبەگم بەپاساوی ئیش نەدەچوو.

پێنج شەممەیەک مۆسقای کەمانجەیەکی غەمگین ئەوناوەی راگیڕابوو، شکۆی بانگێشتی سەریادەوەریەکانی دەکرد، لەدوور دیاربوو کچێک پرچی وەک رەشماڵی رەش شۆڕبووونەوە بەسەر شان وملان، لەسەربەردێک دانیشتووەو مشتووی کەمانجەیەکی بەدەستەوەیەو یادەوەری لێ هەڵدەچنێ، تادەهات زیاترسەرنجی شکۆی رادەکێشا، ئەویش تەواوهەستی بەحەزوئارەزووی شکۆ کردبوو، بەدەستەکانی سڵاوێکی بۆنارد..

شکۆش سڵاوەکەی ناردەوە، دەمەو رۆژئاوا کچەکە هات و زەرفێک میوەی بۆهێنابوون، چاوەکان پڕبوون لەقسە، بەڵام زمان تازە وەرزی گاگۆلەو گڕوگاڵی بوو، هێدی هێدی ئەوینێک چرۆی دەردەکرد، لەگەڵ هەرپێنج شەممەیەکدا عیشقیک بەرین دەبوو، سنوورەکانی تێکدەشکاند، کچێک پڕبەدل دەیویست ببێتە هاودەم وهاوژینی کوڕە جوتیارێکی دێهاتی و قەسەم بەچاوی یەکتر بخۆن، ببن بەسێبەرو سایەیی یەکتر، خانووەکەی دایە بەگم تەواوبوو و عیشقیش کۆت وبەندی خۆی دەشکاند، کاتێک بەگم پێی زانی و ئاشکرابوو، دۆو دۆشاو تێکەڵ بوون، مەحاڵەو سەدجار مەحاڵە، کچە ئیبلیس و خوێن مژ ببێتە بووکی ئاشەوان،

لەگەڵ ئەوەی شکۆ نەیدەویست لەچاکەی دایەبەگم دەربچێ و گەلەک هیلاکی درووست کردنی خانوو و هەواری تازەی بوو، ئێوارەیەک بەنابەدڵی هەواری بەگمێ بەجێهێشت و گەڕایەوە کانی بێرۆکەی منالی، لەوێش هەمووشتێک گۆڕابوو، هەشت نۆ ماڵ تەنیشت و پشتیان لەیەک بوو، مزگەوتێک لەسەر بناغەی پێشووی هەڵچندرابوو، لەدەوری شکۆ کۆبوونەوە..

+ ئەمن شکۆمە، شکۆی سابیری، داکم ناوی سافیەبوو هەرلێرە مرد، ئێرە جێی مارمان بوو، کەستان نامناسنەوە؟

+ کورە بەقورعان راست دەکا، چما ئەتوو مایی ؟ ئەو وەختی گۆتیان ئەقری تێک چووەو ئەشقیابووەو گورگیش خواردیتی، چەند گەڕان لەدوو هێسک وپروسکان هیچیان نەدیتەوە!..

+ کوره بەکەلامی خوای درۆی دەکا، ئەوە قۆربڕە بزانە چ گۆبەندەکی لەبن سەریە.

کەس وکاری شکۆ لەگوندەکە نەمابوون، خوشکەکانی مێردیان کردبوو و چووبوونە ماڵ وحاڵی خۆیان، باوکیشی لەتەنیشت سافیەی خێزانی بەخاک سپێردرابوو، شکۆی تاقانە بەخوشکەکانی شادبوویەوەو گریان و پێکەنینیان ئاسمانی راگێرا.

شکۆو دایە بەگمیش ئاشت بوونەوەو شەونمی نەوەی جەوهەرئاغەش بووە بووکی هەواری ئاشەوان و تا بەگم مرد وەک دایکی خۆی خزمەتی کردو دڵی نەڕەنجاد،

ئێستاش ئەو پرسیارە بێ وەڵام بوو!

ئەرێ ئێمە بۆچی وامان بەسەرهات ؟ بۆچی دەردێک هات و دایکی تاقانەیەکی برد؟،

بۆ چووینە لای بابەشێخ و فەلاقەی کردین ؟

بۆ کۆترەکانمان سەربڕین؟، بۆژەهرمان دەرخواردی سەگەکەدا؟

بۆ تەققەمان لەیەکتر کرد؟، بۆ ئاشەکەمان سووتاند؟، بۆ منداڵمان لەدایکی فڕاندو لەبەر مزگەوتێک فڕێماندا؟، ئێمە رقمان بۆچی بوو؟ بۆیەکترمان ئەتک کرد؟ ئاااااای ئێمە چیمان بەیەکترکرد!.

کە بۆنی ئێوارە لە خوێنم دێ
کە کۆتری غەریبی رۆحم
بە سەر بیرەوەریەکانا دەفڕێ
کە چۆڕاوگی غەم
دێتە خوارێ بەسەر جەستەم
تۆش دێیتەوەو سەر لەنوێ
دەبی بەشەم
منیش دیوانەی جاران و
پەی بۆ مەرگێکی تر دەبەم